


ژمارەی بڵاوکراوە: ١٧

ناوی کتێب: ١٠١ کۆدی بەربەڕۆسا

نووسینی: جیهاد الترباني

وەرگێڕێڕانی: ئەحمەد حەمەئەمین مەنتک

دیزاینی بەرگ: محەمەد جەبار

دیزاینی ناوەوە: ئەیاد نادر

چاپ: یەکەم ٢٠١٩

نرخ: ٥٥٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی ( ٦٩٨ ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە

# پەیوەندیەکی چاوەڕوانەکراو

# دوای نیوە شەو

- سڵاو ١٠١، خۆمم، تکایە دوای گوێگرتن لەم نامە دەنگیە , یەکسەر پەیوەندیم پێوەبکە، کارەکە زۆر بە پەلەیە!

کات نزیک دەبویەوە لە دوانزەو نیوی نیوەشەو بەکاتی گرینویچ، کاتێک کەسێک لەڕێی ژمارەیەکی نەناسراوەوە چەندین جار پەیوەندی بە (نیزال)ەوە کرد، پێش ئەوەی ئەم نامە دەنگییە بنێرێت، کە وای لە نیزال کرد پێوەندی بە خاوەنەکەی بکاتەوە بەم کاتە درەنگەی شەو:

- یەکەم ئەم بێزارکردنە چیە لەم کاتە درەنگەی شەو؟ دووەم ئەوە بەس نییە لەڕێی ژمارەیەکی نەناسراوەوە پەیوەندیت کردوە، لانیکەم لە نامە دەنگییەکەت خۆت بناساندبایە، لە جیاتی ئەوەی بڵێی خۆمم دەتتوانی بڵێی (عبدالعزیز)م، سێیەم کە ئەمەیان لە هەمووی گرنگترە سوپاس بۆ خوا کە سەلامەتی، کەی لە مەغریب گەڕایتەوە؟

- خودا سەلامەتت بکات نیزال، پێش نیو کاتژمێر گەیشتمەوە فرۆکەخانەی هیثرۆ، باسی چ بێزارکردنێک دەکەی؟ لەکەیەوە پێش بەرەبەیان دەخەوی؟ ئایە لەدوای گەشتەکەم وەکو مرۆڤە ئاسابییەکانت لێهاتوە کە شەو دەخەون و ڕۆژ بێدارن؟! بەڵام لە هەمووی گرنگتر بۆچی وەڵامی پەیوەندییە یەک لەدوای یەکەکانم نادەیتەوە؟!

نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و بە گاڵتەوە وەڵامی دایەوە:

- خۆت دەزانی من وەڵامی پەیوەندی کەسی نەناسراو نادەمەوە، بەڵام دوای ئاشنا بوونم بە گەنجێکی مەغریبی نامۆ کە ژمارەکەی لەکاتی پەیوەندی دەشارێتەوە وازم لەم خوەم هێنا، ئێستا وەڵامی هەموو پەیوەندییەک دەدەمەوە، بۆ ئەوەی لە پەیوەندیدابم لەگەڵ ئەم گەنجە پڕخرۆشە دەربارەی سیخوڕی و بیرۆکەی موئامەرە، بەتایبەت کە ئەو هیچ یەک لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەکارناهێنێت، چونکە بەڕای ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بۆ سیخوڕیکردن لەسەر خەڵکی بەکاردەهێنرێن، لەبەرئەوەی بڕیاریبوو بۆ ماوەیەک لەدەست شێتایەتییەکانی ئەم گەنجە بحەسێمەوە دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی پێش حەفتەیەک و پێشی ڕاگەیاندبووم کە تاوەکو کۆتایی مانگی داهاتوو دەمێنێتەوە، بۆیە بڕیارم دابوو ماوەیەک لەدەست پەیوەندییە بێزارکەرەکانی کۆمپانیاکانی پەیوەندی کە بەزۆری بەژمارەی نەناسراون بحەسێمەوە.

- بەداخەوە نەمتوانی مۆڵەتەکەم لەوێ تەواوبکەم، پلەی گەرمی لە (خریبکە) هێندە بەرزە بەرگە ناگیرێت.

- هاوینە جوانەکەی مەغریب و دایکت و خواردنە خۆشەکانیت وازلێهێناوە و گەڕایتەوە بۆ ناو مێش و مەگەز و باران و خواردنی چێشتخانەکان؟! بەخێربێیتەوە بۆ لەندەن هاوڕێ! بەم بۆنەیەوە عبدالعزیز ئەم کارە بەپەلە و مەترسیدارە چییە کە تاوەکو بەیانی ناتوانی چاوەڕێبکەی؟

- واز لەم گاڵتەجارییە بێنە نیزال، کارەکە زۆر جدیە، دوای گەڕانەوەم لە گەشتەکەم، نامە پۆستەییەکانم کردنەوە کە لەماوەی گەشتەکەم بۆم هاتبوون، پۆستەیەکم بینی کە خاوەنەکەی ناو و ناونیشانی تێدا نەنووسی بوو، کاتێک نامەکەم کردەوە لەناویدا پەڕێکی کۆنم بینی، تێیدا ژمارەو شێوەو وشەی نامۆ نوسرابوون، کە من هیچیان لێ تێنەگەیشتم.

- ژمارەو شێوەو وشەی نامۆ؟!

- بەڵێ، لە سەرەوەیدا ژمارەیەک هەیە، لە پاڵیدا برگەی (یا محمد) بە زمانی عەرەبی نوسراوە، دوای ئەوە شێوەیەکی ئەندازەیی وەکو پرگاڵ هەیە کە هێمایە بۆ ماسۆنیەت، ڕاستەوخۆ لە خوارەوەی ئەستێرەیەکی پێنج لا هەیە، لە خوارەوە چوارگۆشەیەکی هێڵدار هەیە، کە لە ناوەڕاستیدا بازنەیەک هەیە، لە خوار چوارگۆشەکە دێڕە شیعرێک نوسراوە بە وشەی عەرەبی کۆن کە لە واتاکەی نەگەیشتم، لە شوێنە جیاوازەکانی پەڕەکە هێما و ژمارەی جۆراوجۆر دابەشبوون، وەکو ئەوەی کۆدێکی ژمارەیی بێت!

- کۆدێکی ژمارەیی؟! هێمای ماسۆنی؟ وشەی عەرەبی کە لە واتاکەی نەگەیشتی؟ وا دیارە هاوڕێ ماندوێتی گەشت و پلەی بەرزی خەریبکە، سەرەڕای ئەمانەش ڕۆمانە سیخوڕییەکان کە لەکاتی گەشتەکانت دەیخوێنیەوە، وایلێکردوی خەیاڵاتی شتی سەیر بکەی، هاوڕێ ئێستا حەمامێکی گەرم بکە، پاشان بخەوە، بەیانی پشت بە خوا دەربارەی ئەو نامەیەی بۆت هاتووە قسە دەکەین، کە ناو و ناونیشانی لەسەر نەنوسراوە.

- نیزال، باش گوێم لێبگرە، ڕاستە ئەم نامەیە بۆ پۆستەکەم هاتوە، بەڵام ئاڕاستەی من نەکراوە، بەڵکو بۆ تۆ نێردراوە تۆ!

- بۆ من نێردراوە؟! ئایە ناوی من لەم نامە کۆدداره نوسراوە؟

- نەخێر، بەڵام لەسەرەوەی لاپەڕەکە و پێش هەرشتێک بە مێڵێکی گەورە ژمارە (١٠١) نوسراوە.

- چی؟! تۆ دڵنیایی لەوەی دەیڵێی عبدالعزیز؟

- بەتەواوی دڵنیام.

- بەڕاستی شتێکی سەیرە! بەهەرحاڵ پێم بڵێ برسیتە؟

- پێش چەند کاتژمێرێک ژەمێکی سوکم لە ناو فرۆکە خواردوە، بەڵام خۆت دەزانی خواردنی ناو فرۆکە چۆنە، داوای خواردنێکی خێرام دەکرد لە چێشتخانەیەک، بەڵام بۆ دوای پەیوەندیەکەی تۆ دوامخست.

- هیچ داوا مەکە، من نانی ئێوارەت بۆ دێنم، تۆ بڕۆ حەمامە گەرمەکەت بکە، من دوای نیو کاتژمێر لە شوقەکەت دەبم، بۆ ئەوەی بزانین چیرۆکی ئەم نامە سەیرە چییە!

***

## وای فای




کاتژمێر لە یەکی بەیانی نزیک دەبویەوە، باو بارانێکی توند بوو لەم شەوە هاوینییەی شەوانی لەندەن، کاتێک نیزال بە پاسکیلەکەی بۆ شـــوقەکەی عبـــدالعزیز بەڕێـــکەوت، دوای تەواوبـــوونی نـــامەکەی عبـــدالعزیز، نیـــزال بەردەوام بیـــری لەو نـــامەیە دەکـــردەوە، کە یادگارییەکانی منداڵی لا زیندوکردەوە، بە خەیاڵ گەشتی بۆ کات و شوێنێکی جیاواز کرد، بەشێوەیەک لەیادی چوو چەترەکەی ببات لەگەڵ خۆی یاخود کۆتەکەی بپۆشێت تاوەکو لە باران بیپارێزێت، هەرکە گەیشـــتە شـــوقەکەی عبـــدالعزیز ســـڵاوێکی خێـــرای کـــردوو خـــواردنەکەی بـــۆ دانـــا کە بـــۆی هێنـــابوو، داوای لێکـرد ئەو نـامەیەی پیشان بدات کە بۆی هاتووە.

- عبدالعزیز بە پێکەنینەوە وتی: نیزال سەیرێکی خۆت بکە لە ئاوێنە!
- ئـــای خـــودایە! ئاگـــام لێنەبـــوو لە دەرەوە بـــارانە! ببـــورە عبدالعزیز بە جلە تەڕەکانم گوزەری شوقەکەتم تەڕکرد.
- کێشـــە نیـــیە هـــاوڕێ، بـــڕۆ ژوورەکەم و جلەکانـــت بگـــۆڕە، خـــاولییەکی نـــوێ لەســـەر دەرگـــاکە هەڵواســـراوە، لەســـەر جـــێگەی خەوەکەم جانتای سەفەرەکەمی لێیە، بیکەوە ئەو جلە مەغریبیەم بۆ

هێنـاوی، کە داوات کردبـوو، بە ڕەنگێکـی ئـاڵتونی وەکـو ئەوەی دەتویست، گەشتێکی تایبەتم بۆ مەراکیش کرد تـاوەکو قوماشەکەی بکڕم، دایکیشم لەسەر ئەو ئەندازەیە بـۆ دوریـوی کە پێتـدام، ئەگەر دەتەوێت جلێکی تر بپۆشی، لە ناو جلەکانم کامیانت دەوێت لەبەری بکە، کە جلەکانت گۆڕی، وەرە چێشتخانە تا بەیەکەوە نـانی ئێـوارە بخۆین.

- سوپاس هاوڕێ، بەیانی پەیوەنـدی بە دایکـی خۆشەویستت دەکەم تاوەکو سوپاسی بکەم، ئێسـتا جلەکـانم دەگـۆڕم و دێم، تـۆ نانی ئێوارەت بخۆ من چەند کاتژمێرێکە نانم خواردووە.

- نیزال بەبێدەنگی نامەکەی ئەمدیو ئەودیو دەکرد، بێ ئەوەی قسە بکـات، عبـدالعزیز بەدەم نـانخواردنەوە سـەیری نیزالـی دەکـرد تاوەکو قسەیەک بکات، دڵۆپەی لێزمە بارانی ئاسمانی لەندەن دەیدا لە پەنــجەرەکە و هەورە بروســکە تاوناتاوێــک بێــدەنگی ژورەکەی دەشکاند، دوای تێپەڕبونی دە خولەک بەم شێوەیە، عبدالعزیز ئارامی لێ بڕا و لە نیزالی پرسی:

- ئایە تێگەیشتی ئەم نامەیە واتای چییە؟

- نـامەیەکی سـەیرە، ڕاسـتیەکەی لە سـەرەتادا وامزانـی گـاڵتەیەکە لەلایەن تـۆوە، بەڵام دوای سـەیرکردنێکی خێـرا بـۆم دەرکەوت نامەیەکی ڕاستیە، ژمـارەیەکی زۆر لە هێمـا لەخۆدەگرێت کە واتای قوڵیان هەیە.

- مەبەستت شێوە ئەندازەیەکانی نێو نامەکەیە؟

- نەک تەنها شێوە ئەندازەیەکان، هێما وشەیەکە واتای زۆر دەگەیەنێت، دەکرێت هێماکان لەسەر شێوەی ئەندازەیی، یاخود نیشانەیەکی دیاریکراو بن، تەنانەت ژمارەکانیش دەکرێت هێمابن بۆ شتێک، وشە و پیت و سەرو بۆر لە هەندێک کات بۆ هێمایەکی دیاریکراو ئاماژەدەکەن.

- تێنەگەیشتم نیزال!

- زۆر بەسادەیی عبدالعزیز، هێماکان ئاماژەن بۆ وێنەیەکی دیاریکراو، شێوەی هەرچۆنێک بێت، بۆ شتێکی دیاریکراو ئاماژە دەکات، یاخود بیرۆکەیەکی دیاریکراو، یان پەیوەندیەکی دیاریکراو، دەکرێت کە مرۆڤ تەنها بە سەیرکردنێک لێی تێبگات بەبێ ئەوەی پێویستی بە وشەی زۆر بێت، هێماکان لە کاتی گەیاندنی زانیاری کات و توانای زۆر بۆ مرۆڤ دەگێڕنەوە.

- نیزال دەکرێت بە نموونەیەک زیاتر ئەمەم بۆ ڕونبکەیتەوە؟

- زۆر باشە، سەیری هێماکانی هاتوچۆ بکە، هەریەکەیان واتایەکی دیاریکراویان هەیە، تەنها بە سەیرکردنی هێماکە لە واتاکەی تێدەگەی، بیربکەوە چی ڕویدەدا ئەگەر ئەم هێمایانە بگۆڕدرابان بەو وشانەی ئەم هێمایانە واتاکانیان دەگەیەنن، شوفێرەکە تا ئەو ڕستە درێژانەی دەخوێندەوە تەرکیزی لەدەست دەدا، ئەمەش دەبووە هۆی ڕووداوەکانی هاتوچۆ، تەنها هێمایەک واتایەک دەگەیەنێت کە لەوانەیە دەیان وشە نەتوانن بیگەیەنن، بۆیە ئێمە لە زۆرێک لە کاروبارەکانی ڕۆژانەمان زمانی هێما بەکاردەهێنین.

- له زۆرێک له کاروباری ڕۆژانەمان؟ پێم وابوو تەنها ڕێکخراوه نهێنییەکـــان زمــــانی هێمــــا بەکــــاردەهێنن!

نیزال پێکەنی و وتی: هـاوڕێی خۆشەویستم عبدالعزیز، هەر ئێستا ئێمە زمانی هێمامان بەکارهێنا!

- مەبەستت چییە نیزال؟

- کاتێـک هـاتمە شـوقەکەت دەستمان لەدەستی یەکترنا و تەوقەمـان کـرد، ئەمەش زمـانێکی هێمـای کـۆنە بـۆ دەربڕینی سڵاوکردن، مرۆڤـی کـۆن تەوقەی دەکـرد لەگەڵ بەرانبەرەکەی، بۆ ئەوەی بۆی دەربخات کە هیچ چەکێکی هەڵنەگرتوە تـاوەکو لەگەڵی بجەنگێت، تا ئەمڕۆکەش ئەم هێمایە بۆ سڵاوکردن بەکاردێت، بۆیە هەرگیز نابینیت دوژمنە ڕاستەقینەکان بە دەست سڵاو له یەکتری بکەن، دوای بەستنی پەیمـانی ئاشـتەوایش یەکەمـین شـت پێی هەڵدەستن دەست دەخەنە دەستی یەکتر و تەوقەدەکەن!

- ئـای خـودایە! هەرگیـز لە ژیـانم بیـرم لەوە نەکردبـوێیەوە تەوقەکردن بەدەست ئەم هەمـوو واتـایە لەخـۆ دەگرێت، نیـزال ئـایە هەموو هێمایەک واتاکەی لە شتێکی هەبوو وەردەگرێت؟

- مەرج نییە، هەندێک جار بە پێچەوانەوەیە، هەندێک جاریش مرۆڤ هێماکان لە شتێکی هەبوو وەردەگرێت، هەندێک جـاری تـریش هێماکـان لە هـیچەوە دروست دەکەن، پاشـان ئەم هێمـایە دەبێـتە هێمایەکی بەناوبانگ، تەنانەت ئەگەر واتایەکی بنچینەیشی نەبێت، بۆ نموونە هێمای داگیرساندن و کوژاندنەوەی هەر ئـامێرێکی کارەبایی، کە لە بـازنەیەک پێکهـاتووە، هێڵێکـی بە ناوەڕاسـتدا هـاتووە، له

ڕاستیدا ئاماژەیە بە ژمارە (٠)و (١)، یەک (١) واتا داگیرساندن و سفر (٠) واتە کوژاندنەوە.



بۆ نموونە خەڵاتی ئۆسکار (The Oscar)، ناوەکەی هیچ واتایەکی ئاماژەیی هەڵناگرێت، ئۆسکار (The Oscar) ناوێکە نراوە لەو پەیکەرەی کە ئەدرێت بە کەسە براوەکان لەلایەن ڕێکخراوێکی ئەمریکی ناسراو بەناوی ئەکادیمیای هونەر و وێنەی جوڵاو، تەنیا لەبەرئەوەی یەکێک لە فەرمانبەرەکان وتویەتی ئەم پەیکەرە لە مامێکم دەچێت کە ناوی ئۆسکارە، ئەکادیمیاکەش بینی ناوەکە کورت و سەرنجڕاکێشە، بۆیە ئەم خەڵاتەی ناونا ئۆسکار، بەمەش ئۆسکار لە هیچەوە بووە هێمایەکی ناودار، هەمان شت بۆ ناوی زۆرێک لە کۆمپانیا بازرگانیەکان ڕاستە، ئەم کۆمپانیایانە هێمایەکی سەرنجڕاکێش بۆ کاڵاکانیان دادەهێنن، هەندێک جار واتادارە و هەندێک جاریش بێ واتا، دوای ئەوە خەڵکی هەڵدەستن بە کڕینی ئەم کاڵایانە تەنها لەبەرئەوەی هەڵگری هێمایەکی بەناوبانگن، مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی لە هێمایە، بۆیە یەکەمین شت لە کاتی دامەزراندنی هەر حزبێک بیری لێدەکرێتەوە دانانی هێمایەکە بۆ حیزبەکە، هەربۆیەش پیاوانی ئایینی زۆرێک لە ئایینەکان هەڵدەستن هێمای تایبەت بە خۆیان دادەنێن، کە بە

تێپەڕبوونی کات ئەم هێمایانە لای شوێنکەوتووانی ئەم ئایینە دەبێتە شتێکی پیرۆز و، پێشبڕکێ دەکەن بۆ نەخشاندنی ئەم هێمایانەو دروستکردنی پەیکەر بۆی، هەندێک جار بە تێپەڕبوونی کات ئەم هێمایانە لای هەندێک لە شوێنکەوتوانی ئایینەکە دەبێتە خودا و دەپەرسترێت و قوربانی بۆدەکرێت و جوانکاری لە زێڕو زیو لەسەر شێوەی ئەم هێمایە دروست دەکرێت و بە ملدا هەڵدەواسرێت، چونکە شوێنکەوتووی ئەم ئایینانە پێیان وایە ئەم هێمایانە لە هێزە شەڕانگێزەکان دەیانپارێزێت.

- پێم وایە تێگەیشتم، دەبێت دانی پێدا بنێم کە تووشی سەرسوڕمان بووم لەوەی کە بیستم، پێم وانەبوو کە هێما ئەو هەموو واتا گەورەیەی لە ژیانمان هەبێت، ئێستا دەتوانیت بۆم ڕوونبکەیتەوە هێماکانی نێو ئەم نامەیە واتایان چییە؟

- دڵنیا نیم کە واتای هەموویان بزانم عبدالعزیز، واتای هەندێکی ئاشکرایە، هەندێکیشی پێویستی بە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە هەیە، دەبێت لە هەندێک شت دڵنیا ببمەوە و لە ئینتەرنێتیش کەمێک بگەڕێم، ئێستا تۆ خواردنەکەت تەواو بکە، چونکە لەو ساتەوەی باسی هێما دەکەین تۆ هیچ پاروێکت نەخواردوە، منیش کۆمپیوتەرەکەم لە جانتاکەم دەردەهێنم و بە وای فای شوقەکەت پێوەستی دەکەم، دوای تەواوکردنی نانی ئێوارە لە ژووری دانیشتن دەتبینمەوە.

دوای ئەوە نیـــزال لە ســەر کورســـییەکەی هەســتا و بەرەو ژووری دانیشتن بەڕێکەوت، عبدالعزیزیش کەوچکەکەی پرکردبوو لە خـواردن و پێش ئەوەی بیخاتە دەمی، نیزال ئاوڕی دایەوەو پێی گوت:

- هەر بەم بۆنەیەوە عبـدالعزیز دەزانیـت وای فـای (Wi-Fi) واتـای چییـە؟ بـڕگەی یەکەم (وای) کـورتکراوەی وشـەی ئینگلیـزی (Wireless)ە واتە بێــتەل، بەڵام بــڕگەی دووەم (فــای) هــیچ واتایەکی نییە، تەنیـا وەکـو تەواوکەرێـک زیادکراوە تـاوەکو هێمـاکە زیاتر سەرنجڕاکێش بێت!

*** *

## نامەیەکی سەیر



نیزال نامەکەی کردەوەو گوتی:

- ئەم نامەیە زۆر سەیرە!

- چ شتێکی سەیرە؟ ژمارەکان یاخود وشەکان یاخود شێوە ئەندازەییەکان؟

- هەر خودی نامەکە سەیرە، ئەوەتا لەسەر پەڕێکی (زەل) نووسراوە، کە جۆرە پەڕێکی زۆر کۆنە، میسرییە کۆنەکان لە نووسیندا بەکاریان دەهێنا.

عبدالعزیز بە گاڵتەوە پرسی:

- نامەکە تا ئەم ڕادەیە کۆنە؟ ئایە نەخشەی گەنجینەکە لە گەنجینەکانی فیرعەونەکان؟

نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

- نا هاوڕێ، مەبەستم ئەوە نییە، نامەکە بەم دواییانە نووسراوە، ئەمەش ئاشکرایە، بە شێوەی نووسین و هێماکانی نووسینەکە، ئەمڕۆ دەتوانی پەڕی زەل لە ئینتەرنێت یاخود دوکانێکی دیاری بکڕیت.

- ئایە ئەو کەسەی نامەکەی ناردوە نەیدەزانی کە ئێمە ئەو شتە ئاشکرا دەکەین؟

- بەدڵنیایەوە دەیزانی، بەڵام لەوانەیە نامەکەی لەسەر ئەم پەڕە نووسیبێت تاوەکو ئاماژە بە شتێکی دیاریکراو بکات!

- ئێستا تێگەیشتم، ئەو کەسەی نووسیویەتی ویستویەتی پێمان بڵێت: شتێکی نهێنی لە میسر هەیە، هەربۆیە ئەم پەڕەی بەکارهێناوە.

- وابزانم هاوڕێ ئێستا خەریکە لە زمانی هێما تێدەگەی، ڕاست دەکەی، لەوانەیە مەبەستی میسر بێت لە بەکارهێنانی پەڕی زەل، بەڵام میسر تاکە ئەگەر نییە، میسرییە کۆنەکان تاکە گەل نەبوون کە ئەم پەڕەیان لە نووسینەکانیان بەکارهێناوە، بەڵکو یۆنانی و ڕۆمانی و فینیقی و گەلی تریش ئەم پەڕەیان بەکارهێناوە، لەبەرئەوە ئەگەر میسر مەبەست بوایە لەم نامەیە، دەکرا هێمایەکی تر بەکارهاتبا کە تایبەت بوایە بە وڵاتی میسر، وەکو هێمایەکی فیرعەونی یان شتی تر.

- کەواتە مەبەست لە بەکارهێنانی پەڕی زەل لە نووسینی ئەم نامەیە چییە؟

- لەوانەیە نووسەری ئەم نامەیە ویستبێتی ئاماژە بە هێمابوونی مێژوو بکات، واتە لەسەرەتاوە تەنانەت پێش خوێندنەوەی نامەکەش لە خوێنەر بگەیێنێت کە هێماکانی ناو ئەم نامەیە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە مێژووەوە هەیە. ئەم ژمارانەی بەکارهێناوە وەکو بەڵگەیەک بۆ هەندێک لەو هێما مێژووییانە کە ڕاستییەکەیان بەشێوەیەکی تر شاردراوەتەوە، بۆ نموونە ئەم ئەستێرە پێنجییە کە ژمارە شەشی لەناو دایە، لە ڕاستیدا ئەستێرەیەکی شەشییە بۆیە ژمارە شەشی لەناو دایە.

- مەبەستت ئەستێرەی جولەکەکانە؟

- باش گوێ بگرە عبدالعزیز، هەرکەسێک لە ئێمە شتەکان بە ئاوێنە تایبەتییەکەی خۆی دەبینێت، بە واتایەکی تر تەنیا شتێک دەکرێت چەند کەسێک بە چەند شێوەیەکی جیاواز ببینن بەپێی

ئەزموون و شارەزایی جیاوازی هەریەکەیان، لەبەرئەوە ژیری مرۆڤ شێوەی شتەکان دیاری دەکات، کە دەیەوێت بیانبینێت بەپێی باوەڕ و ڕۆشنبیری کەسەکە، **بۆیە شێوەی هەرشتێک کە دەیبینین لە ڕاستیدا ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە ژیریمان دەیەوێت بیبینێت!**

- نیزال دەتوانیت نموونەیەکم لەسەر ئەوە پێبڵێیت؟





- سەیری ئەم نموونە سادەیە بکە، هەموومان شێوەی ئەو خاچە چەماوەیە دەناسین کە سەرکردەی ئەڵمانی (ئەدۆڵف هێتلەر) وەکو هێمای حیزبی نازی بەکاری دەهێنا، ئەم هێمایە هەندێک کەس وەکو هێمای ڕەگەزپەرستی و تاوانکاری نازییەکان دەیبینێت، بەڵام هەمان هێما هەندێک کەس وەکو هێمایەکی ئاینی پیرۆز سەیری دەکەن، بۆیە ئەگەر سەیری زۆرێک لە پەرستگاکانی هندۆس و بوزیەکان بکەی ئەم هێمایە لەسەر دیوارەکانی کێشراوە، کە پێی دەوترێت (سواستیکا)(Swastika)، هەمان شت دەربارەی ئەستێرەی شەش، ئەم هێمایە تایبەت نییە بە جوولەکەکان وەک هەندێک بۆی دەچن، بەڵکو مەسیحی و مسوڵمان و تەنانەت بتپەرستەکانیش لە وێنەو نەخشەکانیان بەکاریان هێناوە، ئەگەر سەیری زەخرەفەی زۆرێک لە مزگەوت و بینا ئیسلامییەکان، تەنانەت دراوی ئیسلامی بکەی، دەبینی ئەم ئەستێرەیەی تێدایە . ئەم

ئەستێرەیە لای مسوڵمانان بە (ئەڵقەی سولەیمان) ناسراوە، ئەم ئەستێرەیە هێمایەکی ناودارەو لەسەر زۆرێک لە ئاڵا ئیسلامییەکان کێشراوە، کە لە مێژووی ئیسلامی دەرکەوتوون، هەروەها ئەم هێمایە بە زۆری لە نەخشەکانی وڵاتەکەت (مەغریب) بەکاردێت، هەروەها بە فراوانی لە کارەکانی مسوڵمانانی ئەندەلوس بەکارهاتووە.



- ئەی دەربارەی ئەو هێما ماسۆنییەی لە ناوەڕاستدا کێشراوە چی؟

- لەبیرت بێت هاوڕێ، ئێمە شتەکان بەو شێوەیە دەبینین کە ژێریمان دەیەوێت ببیینێت، تۆ زۆر چیرۆکە سیخوڕی و پیلانگێڕییە جیهانییەکان دەخوێنیتەوە، بۆیە ژێریت ئەم هێمایەی وەکو هێمایەکی ماسۆنی لێکدایەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هێما ماسۆنیەکە لەم هێمایە جیاوازە، ئەو لە دوو شێوەی هاوتا پێکهاتووە کە بریتین لە: پڕگاڵ و ڕاستەیەک، بەڵام ئەو شێوەیەی لە نامەکە هەیە، بریتی یە لە شمشێرێکی دوو سەر.

- مەبەستت شمشێرەکەی پێغەمبەرمان محمدە (صلى الله عليه وسلم) کە ناسراوە بە (ذي الفقار)؟



- بەڵکو مەبەستم ئەو شمشێرەیە کە هەندێک پێیان وایە (ذي الفقار)ە، شمشێری ڕاستەقینەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ناوی (ذي الفقار)ە شێوەکەی بەم شێوەیە نیغە، زۆرێک لە مسوڵمانانی پێشوو لە نیەت پاکیان پێیان وابوو کە ئەم شمشێرە دوو سەرە بریتی یە لە شمشێری پێغەمبەرمان محمد (صلى الله عليه وسلم)، شمشێری (ذي الفقار)ی بەناوبانگ، بۆیە وەکو پیرۆزی شێوەکەیان دەکێشا.

- ئایە لەبەر ئەم هۆیەیە لەسەرەوەی ئەم شمشێرە برگەی (يا محمد) نوسراوە؟

- ئەم برگەیە ناتەواوە و شتێکی کەمە!

- مەبەستت چیغە ئەم برگەیە ناتەواوە؟!

- عبدالعزيز سەیری هەردوو ژمارەی ١٣-٦١ بکە، کە لای دەستە ڕاستی برگەی (يا محمد) نوسراون، ئەم دوو ژمارەیە ئاماژە بە وشەیەکی تایبەت دەکات کە واتای برگەی (يا محمد) تەواودەکات، بۆیە ئەم دوو ژمارەیە ڕاستەوخۆ لای ڕاستی برگەی (يا محمد) نوسراون، لە سەرەوەی یاخود لە خوارەوەی نەنووسراوە، هاوڕێ، تۆ قورئانی پیرۆزت لەبەرە، ئێستا پێم بڵێ ئایەتی ژمارە ١٣ لە سورەتی ژمارە ٦١ چ ئایەتێکە؟

- سورەتی ژمارە ٦١ سورەتی (الصف)ە و ئایەتی ژمارە ١٣ بریتی یە لە:

{وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ) ١٣)}

- نیزال وتی: ئەو بڕگەیەی لە سەرەوە هەیە بەم شێوەیەی لێدێت (وبشر المؤمنين يا محمد).

- بەڵام بۆچی تەنها بڕگەی کۆتایی ئایەتەکەت وەرگرت؟

- عبدالعزیز لەبیرت نەچێت ئێمە شتەکان بەپێی ئەزموونی تایبەتیمان دەبینین، لەبیرتە پێش سێ ساڵ لەمەوبەر لە پشووی هاوین گەشتێکم بۆ ئیستەنبوڵ کرد، لە میانەی گەشتەکەمدا سەردانی مزگەوتی (محمد فاتیح)م کرد لە ئیستەنبوڵ، لەوێ تێبینی چەند نەخشێکم کرد لەسەر دیوار و بنمیچی مزگەوتەکە، یەکێک لەم نەقشانە بڕگەی (وبشر المؤمنين يا محمد) بوو، لەسەرەتادا وامزانی ئایەتێکی قورئانە، بەهۆی شێوازی نووسینەوەی کە لە نووسینی قورئان دەچوو، بەڵام سەرەڕای خراپی یادگەم دڵنیابوم ئەم بڕگەیە لە قورئاندا نەهاتووە، بۆ دڵنیابونەوە دوای نوێژ لە ئیمامی مزگەوتەکەم پرسی، ئیمامی مزگەوتەکە کە زمانی عەرەبی دەزانی پێی گوتم بڕگەی (وبشر المؤمنين يا محمد) دەستەواژەیەکی ناودارە کە عوسمانییەکان بەکاریان هێناوە.

- ئەی ژمارەکانی تری دەوری شمشێرەکە؟

- ژماره ١ ئاماژەیە بە ئەبوبەکری صدیق، جێنشینی یەکەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ژمارە ٢ ئامـاژەیە بە جێنشینی دووەمی ڕاشیدی عومەری کوڕی خەتاب، هەروەها ژمـارە ٣ ئامـاژەیە بە جێنشینی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان، وە ژمارە ٤ ئامـاژەیە بە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، جێنشینی ڕاشیدی چوارەم.

- ئەی ژمارە ٥ کە بە هێڵێکی بچوکتر لەلایەکی شمشێرەکە نووسراوە؟

- ژمارە ٥ ئامـاژەیە بە لەپی دەست، ئەم هێمایە هەندێک لە عوسمانییەکان بەکاریان دەهێنا بۆ ئامـاژەدان بە پێغەمبەر و چوار لە ئـالی بەیتـی کە لە فەرمـوودەی بەناوبـانگی (الـرداء)، بەخـۆیەوە گوشین، ئەوانیش بریتی بوون: لە هەریەکە لە فاتیمەی کچی و عەلی کوڕی ئەبی تـاڵیبی هاوسـەری فـاتیمەو هەردوو منـداڵەکەی فـاتیمە، حەسـەن و حوسـەین.

عبدالعزیز بە سەرسـوڕمانەوە بەبێ ئەوەی هـیچ قسـەیەک بکات بۆ چەنـد چرکەیەک سـەیری چاوەکـانی نیزالـی کـرد، نیـزال ئاگـاداری بێدەنگییەکەی بوو لێی پرسی:

- چی بووە عبدالعزیز؟ کێشەیەک هەیە؟!

- چۆن هەموو ئەمەت زانی؟ بۆچی چـوار ژمـارەکەت بە نـاوی چوار جێنشینەکە لێکدایەوە، بەڵام ژمـارە پێنجـت بە لەپـی دەست لێکدایەوە، بۆچی بۆ نموونە بە جێنشینی ڕاشیدی پێنجەم حەسـەنی کوڕی عەلی لێکت نەدایەوە؟ هێماکـان بەم شـێوەیە واتـا ئەکەی کە خۆت دەتەوێت؟

نیزال زەردەخەنەیەکی بەڕووی عبدالعزیز کرد پاشان وەڵامی دایەوە:

- لەبەر دوو هۆکار هاوڕێ، هۆکاری یەکەم لەبەر شێوە و شوێنی ژمارە پێنج، بە تەواوی لە دەوری شمشێرەکە دانەنراوە وەکو هێمای جێنشینە ڕاشیدینەکانی تر، هەروەها بە هێڵێکی بچوکتر نوسراوە کە لە هێڵی ژمارەکانی تر ناچێت، بەڵام هۆکاری دووەم کە ئەمەیان گرنگترە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێشتر بۆم باسکردی دەربارەی واتای هێماکان، جوانی هێما لەوەدایە بە تەنها سەیرکردنێک پەیامەکەی دەگوازێتەوە، بەتایبەت بۆ کەسێک کە زانیاری پێشوەختەی هەبێت لەبارەی واتای ئەم هێمایە، بۆیە من هەرکە ئەستێرە و شمشێری دوو سەر و دەستەواژەی (یا محمد)م بینی لە واتای زۆرێک لە هێماکانی ناو ئەم نامەیە تێگەیشتم، تەنها پێویستە لەسەرم چونیەکی بکەم لەگەڵ ئەو زانیاریانەی پێشتر هەمبووە، وەکو پێم وتی ژیری خەڵکی تاکە شتێک بەشێوەی جیاواز دەبینێت بەپێی ئەو ئەزمونانەی پێشتر پیایدا تێپەڕیوە، لەبەرئەوەی من پێشتر شێوەی ڕاستەقینەی ئەو شتانەم بینیوە کە ئەم هێمایانە دەری دەبڕن، بۆیە زەحمەت نییە بە یەکەم سەیرکردنی نامەکە، لە واتای هێماکان تێبگەم.

- کەواتە ئەو شێوەیە کامەیە کە هەموو ئەو هێمایانەی لەخۆگرتووە؟

- ئەو شێوەیە ئاڵای بەریبەڕۆسایە!

- بەربەڕۆسا؟! مەبەستت ئەو چەتە بەناوبانگانەیە کە لە فیلم و چیرۆکەکـــــــــــانی چەتەکــــــــــان دەردەکەون؟

نیزال زەردەخەنەیەکی کرد بەڕووی عبدالعزیز و پێی وت:

- وادیــارە هــاوڕێ تــۆ چیرۆکــی ڕاســتەقینەی سـەرکردەی ئەفسانەی گەورە خیرالدین بەربەڕۆسا نازانی!



***

## بەربەڕۆسا

- نیزال لەکاتێکدا سـەیری کۆمپیـوتەرەکەی دەکـرد، گوتی: سەیری ئەم وێنەیە بکە عبدالعزیز.

- ئەم وێنەیە چییە؟

- ئەمە وێنەی بەڵگەنامەیەکی مێژوییە لە میانەی ئامادەکردنی پەرتـوکەکەی پێشـوم دەربـارەی مێـژووی ئەوروپـا لە سـەدەکانی ناوەڕاست دەستم کەوت، نامەکە دەربارەی داوای یـارمەتی کـردنە لە

لایەن مسوڵمانانی غەرناتەوە لە ساڵی ١٥٠١ز بۆ سوڵتانی عوسمانی بایەزیدی دووەم کوڕی محمد فاتیح، تێیدا داوای ڕزگارکردنیان کردووە لەو پاکتاوی نەژادییەی لە دژیان دەکرێت لەلایەن هێزەکانی مەملەکەتی قشتاڵەوە.

- مەبەستت نامەیەکە لەلایەن مسوڵمانانی مەملەکەتی غەرناتەوە لە ئەندەلوس؟ ئەوەی من بزانم ئەو مەملەکەتە ئیسلامییە چەندین ساڵ پێش ئەوە لەناوچووە.

- ڕاستە، غەرناتە کۆتا دەسەڵاتی مسوڵمانانی ئەورووپی بوو لە ئەندەلوس، دواتر لە ساڵی ١٤٩٢ ز کەوتە دەستی هێزەکانی هەردوو مەملەکەتی قشتاڵە و ئاراگۆن، بەڵام کەوتنی شارێک واتای ونبوونی دانیشتوانە مسوڵمانەکەی نییە لە ساتێکدا، بەڵکو سەدان هەزار مسوڵمانی غەرناتە، دوای کۆچی پاشای مسوڵمانی غەرناتە محمدی بچووک مانەوە، بەتایبەت کە پێش کۆچی محمدی بچووک، ڕێککەوتنی کردبوو لەگەڵ هەردوو سەرکردە فردیناند و ئیزابێلا، بەپێی ڕێککەوتنەکە ئازادی پەرستشی دابوو بە دانیشتوانی ئەندەلوس، محمدی بچووک سوربوو لەسەر ئەوەی کە پاپای ڤاتیکان بە شەخسی خۆی زەمانی ئەم ڕێکەوتنە بکات، بەڵام دوای ئەوەی فردیناند و ئیزابێلا دەستیان بە سەر دەسەڵاتی غەرناتەدا گرت، ڕێکەوتنەکەیان شکاند و دەستیان کرد بە لەناوبردنی مسوڵمانانی ئەندەلوس تەنانەت لەناوبردنەکە جوولەکەکانی ئەندەلوسیشی گرتەوە، کە سەدان ساڵ بە ئاشتی و ئازادی لە سایەی دەسەڵاتی مسوڵمانان لە ئەندەلوس دەژیان، پاشان ئەمە پەرەیسەندوو گۆڕا بۆ

دادگاکانی سزادان و کوشتنی ترسناک، کە لە مێژوودا ناسراوە بە (دادگاکانی پشکنین) (Inquisition)، لەم دادگایەدا مسوڵمان و جـوولەکە و مەسـیحییە پڕۆتسـتانتەکانیش سـزا دەدران کە تێگەیشتنیان بۆ ئایین جیاواز بوو لە مەسیحییە کاسۆلیکەکان، لەم دادگایەدا مرۆڤەکان بەشێوازێکی دڕندانە و ترسناک ئازار دەدران، بە ئـامێری تـایبەت بە ڕێگـایەکی لەسـەرخۆ و نامرۆڤـانە، کاتێـک سەرکردەی فەرەنسی (ناپلیۆن پۆناپارت) لەسەرەتای سەدەی نۆزدە ئیسپانیا و پرتوگـالی داگیرکـرد، سـەربازە فەرەنسییەکان سەریان سـوڕما لە ترسـناکی ئەو ئـامێرانەی لە دادگاکـانی پشـکنین بەکـاردەهێنران، کە هێشـتا لە هەنـدێک کەنیسـە پـارێزرابوون، تـا ئێستاش بەشێک لەم ئامێرانە لە مۆزەخانەکانی دادگاکانی پشکنین لە ئیشبیلیە و شارەکانی تری ئیسپانیا هەڵگیراون.

- بەڵام نیـزال بـۆچی کەنیسـەی کاسـۆلیکی لە ئیسـپانیا ڕاسـتەوخۆ خـۆی لە مسـوڵمانان و جوولەکەکـان و گـروپە مەسیحییەکانی تـر لە ڕێگـای کوشـتن لە جیـاتی بەکارهێنـانی ئەم جۆرە سزا ترسناکانە ڕزگارنەکرد؟

- لەبەر دوو هۆکـار: یەکەمیـان دەگەڕێـتەوە بـۆ بـاوەڕی کەنیسەی کاسۆلیکی کە پێی وابوو بڵاوبونەوەی هەواڵـی ترسناکی ئامێر و ڕێگاکانی سزادان دەبێتە بەربەستێک لە بەردەم هەرکەسێک نیازی گۆڕینی مەزهەبی کاسۆلیکی هەبێت.

- هۆکاری دووەم چییە؟

- هـــاوڕێکەم هۆکـــاری دووەم دەگەڕێـــتەوە بـــۆ کەســـایەتی نەخۆشـــی ئەو کەســـانەی ئەم جـــۆرە تیـــرۆرە پەیـــڕەو دەکەن، ڕاســـتیەکەی ئەم جـــۆرە لە پیـــاوانی ئـــاینی، جـــگە لە کۆمەڵێـــک تیرۆریســـتی بکـــوژ چیتـــر نـــین، ئەمـــانە ئـــایغن وەکـــو پاســـاوێک بـــۆ شـــاردنەوەی ئەو تاوانانەیـــان کە هۆکـــارەکەی نەفســـی نەخۆشـــی ئەو کەسانەیە بەکاردێنن، ئەم جۆرە لە تیرۆر کە ئـایغن وەکـو پاساو بە کاردەهێنن تەنها لە نێو مەسیحیەکان دەرنەکەوتـوە، بەڵکـو لە نێـو هەمـوو ئایغنەکـان دەرکەوتـوە و دەریـش دەکەوێـت، هەنـدێک لەوانە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام، ئەم تاوانبارانە هەمان ڕێگـای تاوانکـاری بە کـاردەهێنن ســـەرەڕای جیـاوازی بیروباوەڕیـان، بـۆیە دەبینـی ئەم تیرۆریستانە زۆرجـار تەنهـا بە کوشـتنی کەسـەکە وازنـاهێنن، بەڵکـو چێژ لە دیمەنی سزادانیان دەبینن، هەروەها داهێنانی ڕێگای کوشتنی نامۆ و قێزەون کە بەڵگەیە لەسەر دەروونی نەخۆشیان، نمونەی ئەم بکوژانە لە ناو هەمـوو ئـاغین و نەتەوەیەک هەن، بەڵام ئەوەی جێـی ســـەرنجە دادگاکـــانی پشـــکنین، ڕاســـتەوخۆ لە ژێـــر چـــاودێری و پیرۆزکردنی پاپاکانی کە نیسەی کاسـۆلیکی بـوون، کە تـا ئێسـتاش بۆتە پەڵەیەکی ڕەش لە مێژووی ڤاتیکان، بۆیە لەم ساڵانەی دوایدا کەنیســەی کاســۆلیکی لە ســەردەمی پاپـا یوحەنـا پۆڵســی دووەم (pope john paull II)، هەڵسا بە هەنگاوێکی ئەرێنـی لە ڕێگـــای داوای لێبـــوردن کـــردن بـــۆ هەنـــدێک لەوانەی ڕووبەڕووی چەوســـاندنەوە بـــوون لەلایەن کەنیســـەوە لە مێـــژووی دوو هەزار ساڵەیدا، یەکێک لەو داوای لێبوردنانە کە پاپا پێشکەشی کرد داوای

لێبوردن کردن بوو دەربارەی ئەو کارەساتانەی کە جەنگەکانی خاچ پەرستی بە دوای خۆیدا هێنا، بەم بۆنەیەوە عبدالعزیز، پاپا لە ساڵی ١٩٨٢ز داوای لێبووردنی لە زانای ئیتاڵی (گالیلۆ گالیلی Galileo Galilei) کرد، بەهۆی ئەو ئازار و ئەشکەنجە و بەندکردنەی کە توشی بوو، بەهۆی وتەکانی دەربارەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا، چونکە ئەم وتەیە پێچەوانەی بیروباوەڕی کەنیسە بوو کە پێی وابوو زەوی چەقی گەردونە.

- پێت نەوتم نیزال، چۆن ئەو مسوڵمانانەی لە ئەندەلوس مابون توانیان لەم بارە ترسناکە خۆیان ڕزگاربکەن؟

- لەسەرەتای ئەم مێژووە ترسناکەی ئیسپانیا و پرتوگال، مسوڵمانانی ئەندەلوس هەستیان کرد لەبەردەم پاکتاوکردنێکی نەژادیی ڕێکخراودان، هەربۆیە مسوڵمانانی غەرناتە نامەی یارمەتیدانیان بۆ پاشاکانی جیهانی ئیسلامی نارد، لە نێو ئەمانەشدا نامەیەک بوو بۆ سوڵتانی عوسمانی (بایەزیدی دووەم کوڕی محمد فاتیح)، نامەیەکی تر بۆ (مەلیک ئەشرەف) سوڵتانی مەمالیک لە مصر، بۆیە مەلیک ئەشرەف وەفدێکی نارد بۆ لای پاپا لە ڤاتیکان، هەروەها بۆ لای پاشا کاسۆلیکەکانی ئەوروپا، تێیدا ئیدانەی ئەو کردەوانەی کرد کە مسوڵمانان لە لایەن کاسۆلیکەکان لە شارەکانی ئیسپانیا تووشی بوون، هەروەها ئەوەی یادخستنەوە کە ژمارەیەکی زۆری مەسیحی لە وڵاتانی ئیسلامی ژێر حوکمی ئەو بە ئازادی دەژین.

- ئایا دوای ئەوە ئەم کردەوانە دژی مسوڵمانان وەستان؟

- به پێچەوانەوە بەڵکو بازنەکانی ستەم و سزادان فراوانتر بوون، مسوڵمانانی ئەندەلوس ناچار دەکران بە گۆڕینی ئایینیان بۆ مەسیحی کاسۆلیکی، کە لە مێژوودا ناسراون بە (مۆریسکییەکان)، بەڵکو وای لێهات پیاوانی کەنیسە خۆیان سەرپەرشتی ئەم کردەوانەیان دەکرد، تا دڵنیابن لە ڕاستی ئیمانی مۆریسکییەکان، هەرکەسێک کەنیسە گومانی لە ئیمانی هەبوایە ڕووبەڕووی خراپترین سزادانی هێواش دەبویەوە، لەژێر زەمینە تاریکەکانی کەنیسەکان، چەندان ئامێری سزادان دروستکرابوون بەتایبەت بۆ بەکارهێنان لە دادگاکانی پشکنین.

- باشە بۆچی مسوڵمانانی ئەندەلوس ڕاستەوخۆ دوای ئەم کارەساتانە پەنایان نەبردە بەر وڵاتانی تری مسوڵمان؟

- کارەکە بەم سادەییە نەبوو کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە عبدلعزیز، هەندێک لە مسوڵمان و جوولەکەکان پەنایان بردە مەغریب و وڵاتانی تری باکوری ئەفریقیا، بەڵام سەدان هەزار لە مسوڵمانانی ئەندەلوس و بەشێک لە جوولەکەکان نەیان توانی لە خاکی باو باپیرانیان لە ئەندەلوس هەڵبێن بە تایبەت دوای ئەوەی شاژنە ئیزابێلا بڕیاریدا هەرکەسێک دەیەوێت کۆچ بکات، دەبێت منداڵەکانی لە دوای خۆی جێبێڵێت، تاوەکو کەنیسە پەروەردەکردنی بگرێتە ئەستۆ، بۆیە چەندان نامەی بە هاناوەچونی مرۆڤ دۆستانەیان نارد بۆ پاشا و سەرکردەکانی دونیای ئیسلامی، پرۆسەی ڕزگارکردنی ئەم کەسە لاوازانە دەستی پێکرد، لە گرنگترینی ئەم پرۆسانەش ئەوەبوو کە سەرکردەی دەریایی مسوڵمانی ئەورووپی لە بنەڕەت ئەلبانی پێی

هەستا، ئەم سەرکردەیە لە یەکێک لە دوورگەکانی یۆنان لە دایکبووە، دواتر دەبێتە بە ناوبانگترین سەرکردەی دەریایی لە سەدەکانی ناوەڕاست، دوای هەستان بە گەشتێکی نیمچە مەحاڵ بەرەو ئەندەلوس، لە میانەیدا دەیان هەزار مسوڵمان و جوولەکە لە دادگاکانی پشکنین ڕزگار دەکات، ئەم سەرکردە دەریاییە مسوڵمانە ناوی (خضری کوڕی یعقوب)ە، دواتر بە خیرالدین پاشا ناوبانگی دەرکرد، بەڵام لای ئەوروپییە کاسۆلیکەکان بە ناوی چەتە ڕیش سوورەکان بەربەڕۆسا ناسرابوو!

- نیزال دەتەوێت بڵێیت کە چەتە ڕیش سوورەکان کە بە منداڵی لە کارتۆن و فیلمی چەتەکان دەمانبینی لە ڕاستیدا بریتی بوو لە سەرکردەی مسوڵمانی گەورە، کە دەیان هەزار کەسی بێتاوانی لە مسوڵمان و جوولەکەکان لە دادگاکانی پشکنین ڕزگار کردووە؟!

- هەندێک کات مێژوو بۆ شاردنەوەی ڕاستییەک لە تەواوی خەڵکی فێڵی تێدا دەکرێت، هەندێک کەس وێنەی پیاوە گەورە و پاڵەوانەکان دەشێوێنن و بە بچوکی پیشانیان دەدەن، ئەو کەسانە ژیانی گەورەیەک لە گەورەکانی مێژوو دەشێوێنن و وەکو تاوانبارێک یاخود چەتەیەکی دەریایی پیشانی دەدەن، لە هەمان کاتدا وێنەی تاوانبارێک لە تاوانبارەکانی مێژوو گەورەدەکەن و وەکو پیاوێکی گەورە پیشانی دەدەن، هەموو ئەمانەش دەوەستێت لەسەر چوارچێوەی فیکری ئەو کەسانەی مێژوو دەنووسنەوە و ئاستی پاکی و بێلایەنیان، بۆ نموونە سەرکردەی بە ناوبانگی ئەفریقیای باشور

(نیڵسـۆن مانـدیلا)، لای لایەنگـر و ئـازادی خـوازانی جیهـان تێکۆشەرێک بوو لە پێناو ئازادی، بەڵام بۆ حکومەتی ڕەگەزپەرستی ئەفریقیای باشوور تەنها تاوانبارێـک بـوو، کە سزاکەی بیسـت سـاڵ زیندانی بوو لە دورگەیەکی دابڕاو بەناوی دورگەی ڕۆبن، هەمان شت بۆ زۆرێک لە پیاوە گەورەکانی مێـژوو خۆی دوبارەدەکاتەوە، کە تـا ئێسـتاش بە وێنەیەکـی جیـاواز دەیـانبینین بە پێـی ئەو گۆشـەیەی لێیان دەڕوانرێت.

- عبدالعزیز پرسیاری کرد: بەڵام ئەو پەیامە نهێنییە چییە کە دەیەوێت تێمـان بگەیەنێـت لە میـانەی دانـانی ئـاڵای بەربەڕۆسـا لەم لاپەڕەیەدا؟

- بەتەواوی نـازانم، بەڵام لەوانەیە ئەم نـامەیە بریتـی بێـت لە نهێنییـەک، ئەو کەسـەی نـاردویەتی بیەوێـت ئاگادارمـان بکـاتەوە لە شـتێکی نهێنـی کە پەیوەنـدی بە مێـژووی بەربەڕۆسـا هەیە، بـۆیە وێـنەی ئـاڵاکەی لەسـەرەوەی لاپەڕەکە دانـاوە، ئـاڵا لە زمـانی هێمـا واتای پێناس و ناسنامە دەگەیەنێت، بۆیە خەڵکی سووربوون لەسـەر بەرزکـردنەوەی ئاڵاکانیـان و بەرزهێشـتنەوەیان بـۆ دەرخسـتنی ناسنامەو جیاکەرەوەکانیان، ئاڵا هەمیشە شوێنەکەی لەسەرەوەیە.

- عبدالعزیز بە پێکەنینەوە وتی: نهێنی بەربەڕۆسا!

- دەتوانیت هەرناوێک پێت خۆشە لەسەرئەم نهێنییەی دابنێیت هـاوڕێکەم، گرینـگ ئەوەیە کلیلـی دۆزیـنەوەی شـاردراوەتەوە لەو شێوەیەی کە لە خوار ئاڵای بەربەڕۆسا هەیە.

- مەبەستت ئەو تۆڕە چوارگۆشەیەیە؟

- بەڵێ عبدالعزیز مەبەستم ئەو تۆڕەیە کە بە ناوبانگە بە بێژینگی ئیراتوستینس.

## بێژینگی ئیراتوستینس

- نیزال، ئەو بێژینگە چییە کە باسیدەکەی؟

- ئەم بێژینگە دەدرێتە پاڵ زانای یۆنانی ئیراتوستینس( Eratosthenes)، کە لای زانایانی شارستانییەتی ئیسلامی پێی دەوترێت ئیراتۆس، ئەو زانایەکی بیرکاریزان و شاعیر و مێژوونووس و جوگرافیناس و گەردووناسێکی یۆنانی بوو، بە یەکێک لە گەورەترین کەسایەتییەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێت، ساڵی ٢٧٦ پێش زایین لە شارێکی نزیک بەنغازی لیبیا لە دایکبووە، کە پێی دەوترا شاری قورینا، ئەمرۆ بە شاری شحات ناسراوە، دواتر ئیراتوستینس سەفەر دەکات بۆ مصر و لەلایەن پاشا بەتلیمۆسی سێیەم دەکرێتە بەڕێوبەری کتێبخانەی بەناوبانگی ئەسکەندەریە، هەروەها ئیراتوستینس هاوڕێیەکی نزیکی زانای گەورەی یۆنانی ئەرخەمیدس بوو، مێژوونووس و پزیشکی ئەندەلوسی ئیبن جولجول خاوەنی پەرتوکی ( طبقات الأطباء و الحکماء) دەربارەی ئەم زانایە دەڵێت: (کەس لە ئیراتۆسی ئەستێرەناس زاناتر نەبوو).

- چی وایکرد ئەم زانایە کە تەنانەت ناویشیم نەبیستوە ببێتە زانایەکی گەورە تا ئەم ئاستە؟

- هاوڕێکەم پێویستە بزانی لە ڕاستیدا یەکەم کەس لە مێژوودا وشەی جوگرافیا (Geography)، کە بە زمانی یۆنانی

به واتای وێنەی زەوی دێت بە کاری هێناوە ئیراتوستینس بووە، نەک هەر ئەوە بەڵکو ئەم زانا یۆنانییە یەکەم کەس بووە بە ڕێگەیەکی زانستی سەلماندویەتی کە زەوی خڕە.

- واتە ئیراتوستینوس یەکەم کەس بووە وتویەتی کە زەوی خڕە نەک تەخت، وەکو هەندێک باوەڕیان وابوو؟

- بە تەواوی مەبەستم ئەوە نەبوو عبدالعزیز، سەدان ساڵ پێشتر بیرۆکەی خڕێتی زەوی زانرابوو لەلایەن چەند زانایەکەوە، لەوانە (ئەرستۆ)، پێش ئەویش (فیساگۆرس).

- مەبەستت هەمان فیساگۆرسە کە لە قوتابخانە بیرۆکەکەیمان خوێندوە؟

- بە تەواوی نازانم لە مەغریب چیتان خوێندوە عبدالعزیز، بەڵام ئەگەر مەبەستت بیرۆکەی ئەندازیاری فیساگۆرس بێت دەربارەی سێگۆشەی گۆشە وەستاو، ئەوە هەمان فیساگۆرسە کە من دەربارەی دەدوێم، بە هەرحاڵ هاوڕێ، فیساگۆرس یەکەم زانابووە کە قسەی لەبارەی خڕیەتی زەوی پێش ٥٠٠ ساڵ پێش زایین کردووە، بەڵام ئیراتوستینس ساڵی ٢٤٠ی پێش زایین ئەمەی بە ڕێگەیەکی زانستی سەلماند لە ڕێگای دۆزینەوەی چێوەی زەوی.

- عبدالعزیز بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ئەژمارکردنی چێوەی زەوی! ئایا ئیراتوستینس لەو سەردەمە زووەی مێژووی زەوی هێندە ئامێری پێشکەوتووی لەبەردەستدابوو کە بتوانێت بە تەواوی چێوەی زەوی بدۆزێتەوە؟!

- هاورێ ڕەنگە توشی سەرسوڕمان بیت ئەگەر بزانی ئەم زانا یۆنانییە لێهاتووە تەنها گۆچان و کۆمەڵێک ئامێری ئەندازیاری سەرەتایی لەبەردەست بوو، بەڵام توانی چێوەی زەوی بدۆزێتەوە لەڕێگەی بە کارهێنانی شتێک کە بە داخەوە زۆرێک لە ئێمە بە کاری ناهێنین، ئیراتوستینس ژیری بەکارهێنا، هاورێ ژیری ئەگەر بە ڕێگەیەکی دروست بە کاربهێنرێت هەل دەبەخشێتە مرۆڤەکان بۆ بەدیهێنانی چەندان شتی مەحاڵ لە چەندان شتی سادەوە، ئیراتوستینس بیستبووی کە سێبەری ستونەکانی شاری ئەسوان لە باشوری میسر لە نیوەڕۆی ڕۆژی ٢١ی یۆنیۆ بە تەواوی ون دەبن، لە کاتێکدا ستونەکانی شاری ئەسکەندەریە کە خۆی تیایدا دەژیا لە هەمان کات و بەروار سێبەری دەدا، کە ئەمەش خڕێتی زەوی دەچەسپاند، ئەگەر زەوی تەخت بوایە ئەوا تیشکی خۆر دەبووە هۆی دروستکردنی سێبەر لە هەمان کاتدا لە هەردوو شاری ئەسوان و ئەسکەندەریە، جیاوازی سێبەر ناتوانرێت لێکبدرێتەوە تەنها بە قۆقزێتی زەوی نەبێت، کە تیشکی خۆر گۆشەیەکی جیاواز دروستدەکات لە نێوان ستونەکانی شاری ئەسوان و شاری ئەسکەندەریە، ئیراتوستینس بە بەکارهێنانی گۆچانەکەی دۆزیەوە گۆشەی نێوان ئەسوان و ئەسکەندەریە بڕەکەی ٧.٢ پلەیە بە درێژایی گۆی زەوی، واتا ١ لە پەنجا بەشی چێوەی زەوی کە یەکسانە بە ٣٦٠ پلە ، دواتر هەستا بە پێوانی دوری نێوان هەردوو شاری ئەسوان و ئەسکەندەریە بە پێ لە ڕێگای پیاوێکەوە، ئیراتوستینس بۆی دەرکەوت دوری نێوان هەردوو شارەکە دەکاتە

نزیکەی ۸۰۰ کم بەپێوانەی ئەمڕۆ، بە لێکدانی ژمارە ۸۰۰ لە ژمارە ٥٠ دەکاتە ٤٠ هەزار کم، ئەمەش بە نزیکەیی یەکسانە بە چێوەی زەوی.




- عبدالعزیز لە کاتێکدا سەیری پەڕەکەی دەکرد گوتی: کەواتە ئەمەش لێکدانەوەی وێنەی ئەو بازنەیە کە لە ناویدا ژمارە ٤٠ نوسراوە!
- بەتەواوی ڕاستە عبدالعزیز، بازنەکە هێمایە بۆ زەوی، ژمارەکەش هێمایە بۆ چێوەکەی کە بە نزیکەیی یەکسانە بە ٤٠٠٠٠کم.
- کەواتە مەبەستی خاوەنی نامەکە بە دانانی هێمای زەوی لە چوارچێوەی هێماکانی ناو ئەم نامەیە پڕ نهێنییە چییە؟
- نازانم هاوڕێ، بەڵام لەوە دڵنیام ئەم وێنەیە هێمایە بۆ زەوی، لەوانەیە دانەری ئەم نهێنییە بیەوێت بەمە ئاماژە بکات بەوەی ئەم تۆڕە بێژینگەکەی ئێراتۆستینسە، بۆیە وێنەی زەوی و چێوەکەی لەناو داناوە وەکو ئاماژەیەک بۆ ئێراتۆستینس کە یەکەم کەس بوە چێوەی زەوی دۆزیوەتەوە.
- ئەم بێژینگە چییە کە دراوەتە پاڵ ئەم زانا یۆنانییە؟!

- بێـــژینگەکەی ئیراتوســـــتینس ( Sieve Of Eratosthenes) بـریتییە لە خـوارزمییەکی سـادە کە زانـای یۆنـانی ئیراتوسـتینس لە سـەدەی سـێی پـێش زایـین دۆزیەوە بۆ دۆزینەوەی هەموو ژمارە خۆبەشەکان تا ژمارەیەکی دیاریکرا، ژمارەی خۆبەش (Prime Number)، هەر ژمارەیەکە لە یەک گەورەتر بێت و تەنها دابەش بێـت بەسـەر خـۆیی و یەکدا بەبـێ مـانەوە، بۆ نمونە ژمارە پێنج ژمارەیەکی خۆبەشە، چونکە تـەنهـا دابەش دەبێت بەسـەر خـۆی و یەکـدا، بەڵام ژمـارە ١٠ ژمـارەیەکی خـۆبەش نییە چونکە دابەشدەبێت بەسەر ١, ٢, ٥, ١٠ بەم شێوەیە بۆ هەموو ژمارە سروشتییەکانی تر، بێژینگەکەی ئیراتوستینس لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە کە تەواوی ژمارەکـان لە بێژینـگ بـدات و تەنهـا ژمـارە خۆبەشەکان لەناو بێـژینگەکە بمێننەوە، ئەمەش بە دانـانی ژمارەی یەکەمی خۆبەش و لابردنی تەواوی دوو هێندە هاوشێوەکانی، پاشان ژمارەی خۆبەشی دووەم و لابردنی دوو هێندە هاوشێوەکانی، تـاوەکو لەناو بێژینگەکە تەنها ژمارە خۆبەشەکان دەمێننەوە.

| 1 | 2 | 3 | ~~4~~ | 5 | ~~6~~ | 7 | ~~8~~ | ~~9~~ | ~~10~~ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 11 | ~~12~~ | 13 | ~~14~~ | ~~15~~ | ~~16~~ | 17 | ~~18~~ | 19 | ~~20~~ |
| ~~21~~ | ~~22~~ | 23 | ~~24~~ | ~~25~~ | ~~26~~ | ~~27~~ | ~~28~~ | 29 | ~~30~~ |
| 31 | ~~32~~ | ~~33~~ | ~~34~~ | ~~35~~ | ~~36~~ | 37 | ~~38~~ | ~~39~~ | ~~40~~ |
| 41 | ~~42~~ | 43 | ~~44~~ | ~~45~~ | ~~46~~ | 47 | ~~48~~ | ~~49~~ | ~~50~~ |
| ~~51~~ | ~~52~~ | 53 | ~~54~~ | ~~55~~ | ~~56~~ | ~~57~~ | ~~58~~ | 59 | ~~60~~ |
| 61 | ~~62~~ | ~~63~~ | ~~64~~ | ~~65~~ | ~~66~~ | 67 | ~~68~~ | ~~69~~ | ~~70~~ |
| 71 | ~~72~~ | 73 | ~~74~~ | ~~75~~ | ~~76~~ | ~~77~~ | ~~78~~ | 79 | ~~80~~ |
| ~~81~~ | ~~82~~ | 83 | ~~84~~ | ~~85~~ | ~~86~~ | ~~87~~ | ~~88~~ | 89 | ~~90~~ |
| ~~91~~ | ~~92~~ | ~~93~~ | ~~94~~ | ~~95~~ | ~~96~~ | 97 | ~~98~~ | ~~99~~ | ~~100~~ |

- هیچ تێنەگەیشتم، دەتوانی بە نموونەیەک جوانتر بۆم ڕوونبکەیتەوە؟

- باشە عبدالعزیز، ئەگەر یەکەم ژمارەی خۆبەش، ژمارە دوو وەربگرین پاشان تەواوی دوو هێندەکانی ڕەشبکەینەوە، بەمەش ژمارەکانی (٤،٦،٨،١٠،١٢) ڕەشبکەینەوە پاشان بێینە سەر ژمارەی خۆبەشی دووەم کە ژمارە سێیە و دوو هێندەکانی ڕەش بکەینەوە، ژمارە ٦ پێشتر ڕەشکراوەتەوە بۆیە دوو هێندەکانی تری ڕەش دەکەینەوە وەکو (٩،١٥،٢١) تا کۆتایی بەردەوام دەبێت، هەر بەم شێوەیە بۆ تەواوی ژمارەکانی تر ئەکەی بە شێوەیەک کە تەنها ژمارە خۆبەشەکان بمێننەوە بەبێ دووهێندەکانیان.

- کەواتە ئێمە لێرەدا دە هێڵی ئاسۆیی و دە هێڵی ستونیمان هەیە، پێتوایە بۆ دۆزینەوەی نهێنی بەربەڕۆسا پێویستمان بە ژمارە خۆبەشەکانی نێوان ژمارە ٢ هەتا ژمارە ١٠٠ هەیە؟

- نیزال پێکەنی و گوتی هەرگیز هاوڕێ، هیچ یەک لە ژمارەکان چارەسەری نهێنی بەربەڕۆسای تێدا نییە.

- بەڵام تۆ لەسەرەتای قسەکانمان گوتت کە چارەسەری نهێنی بەربەڕۆسا لەم وێنەیە دایە؟!

- ڕاستە، عبدالعزیز سەیری ئەو دێڕە شیعرەی خوار بێژینگەکە بکە:

من مبلغ الحيين ان مهلهلا

لله دركما و در ابيكما

مجندلا لله دركما و در ابيكما

بەم شێوەیەش دوو کۆیلە بکوژەکە کوژرانەوە، دوای ئەوەی زیر سالم توانی ئاشکرایان بکات بەهۆی نامەیەکی ڕازدارەوە کە تیایدا دێڕێکی لابردوە، کە زانیاری گرنگی تێدایە و دەمانگەیەنێتە دۆزینەوەی نهێنیەکە.

- ١٠١ دەتەوێت پێم بڵێیت دانەری ئەم نهێنییە هەمان ڕێگەی زیر سالمی بەکارهێناوە ئەویش بە لابردنی دوو دێڕ، کە ئەو ژمارانەی تێدایە پێویستمانە بۆ دۆزینەوەی ئەم نهێنییە؟
- بژیت عبدالعزیز، ئەمەش لە ڕێگای دوو تێبینییەوە، تێبینی یەکەم لە نهێنی ژمارە ٤٠ کە لە ناوەڕاستی بیژینگەکەی شاردراوەتەوە، دروستە ئەمە ئاماژەیە بە چێوەی زەوی وەکو باسمان کرد، بەڵام جەنگی بەسوسیش کە زیر سالم کردوویەتی ٤٠ ساڵی خایاندوە، هەروەها بوونی ژمارە ٤٠ لە ناوەڕاستی بێژینگەکە لەوانەیە لە بنچینەدا ئاماژەبێت بە چیرۆکی دوو دێڕە ونبوەکە لە چیرۆکی مردنی زیر سالم.
- عبدالعزیز بە پێکەنینەوە پرسی، لەبارەی تێبینی دووەم چی ئەی لێکۆڵەرەوەی تاوان؟
- تێبینی دووەم هاوڕێکەم لەوەدایە کە ئەو دوو دێڕەی شاردراوەتەوە لە بێژینگی ئێراتوستینس بە ژمارە ١٠١ دەستپێدەکات کە ئەویش ژمارەیەکی خۆبەشە.

- نیزال ئێستا کارەکە لۆژیکییە، ئەو کەسەی ئەم نهێنیەی داناوە بەتایبەتی دەیەوێت کە تۆ لێرەوە دەست پێ بکەی، لەم ژمارەیەوە کە هێمایە بۆتۆ، ئەویش ژمارە (١٠١)ە، ئەویش ژمارەیەکی خۆبەشە وەکو گوتت،ئەوەش ئاماژەیە بە سەرەتا، یەکەم هەمیشە لەسەرەتادا دێت، ئەم ژمارەییە ١٠١ کلیلی دۆزینەوەی نهێنیەکەمانە بۆیە لەسەرەوەی نهێنیەکە نوسراوە، لەسەرەوەی هەموو هێماکانی تر، بۆیە ئەو ژمارانەی کە چارەسەری مەتەڵەکەی تێدایە بریتیە لە ژمارەکانی نێوان ١٠١ تاوەکو ١٢٠.

نیزال سەیری چاوەکانی عبدالعزیزی کرد کە بەپەرۆشەوە لێکدانەوەکەی باس دەکرد، دەستی خستە سەرشانی و پێی گوت:

- ئەوە چیە عبدلعزیز؟! لە تێگەیشتنی زمانی ئاماژە بویتە کەسێکی شارەزا، لێکدانەوەکەت زۆر جوان بوو، تێبینی شتێکت کرد کە من تێبینیم نەکردبوو، ئەویش ئامازەی وشەی یەکەمە وەکو هێمایەک بۆ سەرەتا.

- بەڵام بۆچی خاوەنی نهێنی بەربەرۆسا هەستاوە بە ناردنی ئەم نامەیە بە تایبەتی بۆ تۆ نیزال؟

- هاورێ ئەم پرسیارە توشی سەرسورمانی کردم، بەڵام وەکو لە نامەکەوە دیارە ئەو کەسەی ناردویەتی زۆر شت لەبارەی من دەزانێت، دەزانێت نازناوەکەم (١٠١)ە، کەتەنها کەسە نزیکەکانم دەیزانن، هەروەها دەزانێت تۆ هاورێی نزیکی منی، بۆیە نامەکەی لای تۆ جێهێشتوە، هەروەها لە میانەی بەکارهێنانی هێما سەیرەکانی وا دەردەکەوێت کە دەزانێت من تایبەتمەندم لە زانستی هێما ناسی

(Symbology)، هەروەها دەزانێت من گرنگی بە مێژوو دەدەم، نـازانم ئەو نهێنـیە چیە کە ئەو هەمـوو شـتێکی ژیانی تـایبەتیم دەزانێـت، ئەو پرسـیارەی کە توشـی سەرسـوڕمانی کـردووم ئەوەیە، بۆچی ڕاستەوخۆ نەیبینیوم یان پەیوەندی پێوە نەکردووم؟

- لەوانەیە لەبەرئەوە بێـت ئێسـتا بـوونی نەبێـت نیـزال، ویستویەتی ئەم نامەیە لەکاتی ونبونی بگات، بەڵام ئەو پرسیارەی وەڵامەکەی نازانم ئەوەیە، بۆچی خاوەنی نهێنی بەربەرۆسا ئەم ڕێگە دوورەی بەکارهێنـاوە بـۆ گەیانـدنی زانیاریەکانی بە تـۆ؟ بۆچی بۆ نمـونە ڕاسـتەوخۆ نەینوسـیووە کە هەڵهێنـانی ئەم مەتەڵە لە بەکارهێنانی ژمارەکانی نێوان ١٠١ تاوەکو ١٢٠ شاردراوەتەوە؟!

- ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ واتای ڕاستەقینەی بەکارهێنـانی زمانی هێما، هێماکان تەنها بۆ گەڕاندنەوەی هەوڵ و کات نیین بۆ گەیاندنی ئەو نامەیەی کە پێویستە بگات بە کەسێک، بەڵکو هەنـدێک کات لە هەنـدێک حـاڵەت وەکـو زمـانێکی کـۆددار بۆگەیانـدنی نـامەیەکی مەترسـیدار کە نابێـت بگـاتە دەسـتی دوژمـن بە کـاردەهێنرێن، وە لەکاتێکدا بکەوێتە دەستیان، ئاشکراکردنی کۆدەکان و تێگەیشتن لە هێماکانی ناو نامەکە کارێکی گران بێت، بـۆیە ڕێکخـراوە نهێنەکان و دەزگاکـانی هەواڵگـری پەنـا دەبەنە بەر بەکارهێنـانی هێماکـان لە نامەکانیاندا.

- نیـزال ئەمە واتـای ئەوەیە کە دانەری نهێنـی بەربەرۆسـا بەئەنقەست نامەکەی گەیاندووەتە مـن، نەک ڕاسـتەوخۆ بینێرێت بۆ

پۆستەکەی تۆ، لە ترسی ئەوەی نامەکە ئاشکرابێت، ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەو دەزانێت تۆ لەژێر چاودێری دای؟

- لەوانەیە بەم شێوەیە بێت، یاخود لەوانەیە تەنها وەرگرتنی ئیحتیاتێکی زیاتر بێت لەلایەن دانەری نهێنیەکەوە، بەهەرحاڵ نابێت دوو لایەن دەستیان بەم نامەیە بگات.

- مەبەستت چییە نیزال؟

- سەیرکە عبدالعزیز، ئەم دوو سێگۆشەیەی لە خوارەوە دەبینی لە هەردوو لای دێرە شیعرەکەی زیر سالم، سێگۆشەی سوور لە زمانی هێماکانی هاتووچۆ هێمای مەترسیە، هەردوو سێگۆشەکە ژمارەیەکیان تێدایە، هەریەکەیان ئاماژەن بۆ لایەنێکی دیاریکراو کە مەترسییەکی گەورەیان هەیە، ئەوەی کە زیاتر پشت ڕاستی مەترسی ئەم دوو لایەنە دەکاتەوە بوونی دوو سێگۆشەکەیە ڕاستەوخۆ لەژێر وەسیەتەکەی زیر سالم، کە تێیدا ئاماژەی بە دوو بکوژەکەی کردووە کە ناپاکیان لەگەڵ کردوەو کوشتویانە، ئەمەش ئاماژەیە کە ئەو دوو ژمارەیە، ئاماژە بۆ دوو لایەن ئەدەن کە شێوازی تیرۆرکردنی نهێنی بەکاردەهێنن.

- هێدی هێدی خەریکە دڵەڕاوکێم تووش دەبێت! وادیارە هەموو هێماکانی ناو ئەم نامەیە بەڕێگایەکی سەیر پێوەستن بە یەکتریەوە! نیزال ئایە تۆ دڵنیایی لەم لێکدانەوانەت؟

- بەتەواوەتی نا هاورێ، هەمیشە ئەگەری هەڵە هەیە، بەپێی بارودۆخ و زانیاریە بەردەستەکان تاکە هێمایەک ئاماژە بە چەند شتێک دەکات، دەکرێت هێمایەک لە کاتێکدا ئاماژە بێت بە شتێکی

دیاریکراو بەڵام بەتێپەڕبوونی کات و دۆزینەوەی زانیاری تازە، هەمان هێما ئاماژە بەشتێکی تر بکات.

- بەڵام ئەم دوو لایەنە مەترسیدارە کێن کە هەوڵدەدەن بگەن بە نهێنی بەریەرۆسا؟

- بەداخەوە ناتوانم دیاریان بکەم عبدالعزیز، ئەم دوو ژمارەیە ئاماژە بە هیچ هێمایەک کە پێشتر زانیبێتم ناکەن.

- بەم بۆنەیەوە نیزال، بە درێژایی ئەم ساڵانەی تۆم ناسیوە باسی نهێنی ژمارە (١٠١)ت بۆ نەکردووم، کە لەلایەن هاوڕێیە نزیکەکانتەوە پێی بانگ دەکرێیت، هەروەها بەبۆنەی ئەم نامە سەیرەوە کە بەم ژمارەیە ئاراستەت کراوە لەجیاتی ناوی راستەقینەت، پێم وایە کاتی ئەوە هاتوە باسی چیرۆکی خۆتم لەگەڵ ژمارە ١٠١ بۆ بکەی.

- باشە، چیرۆکەکەت لە سەرەتاوە بۆ باس دەکەم بەڵام ئێستا نا، کاتێکی زۆرمان دەبێت بۆ قسە گۆڕینەوە لە ڕێگا پڕ سەرکێشیەکەمان.

- باسی کام سەرکێشی دەکەی؟!

- ئەو سەرکێشیەی بەیانی دەستی پێ دەکەین ان شاءالله، جانتەکەت کە لە مەغریب پێی گەڕایتەوە هێشتا ئامادەیە، بۆیە تۆ پێویستت بەکاتی زۆر نابێت بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ گەشت.

- گەشت بەرەو کوێ؟

- گەشت بەرەو شاری ئیستەنبۆڵی تورکیا، بۆ سەردانکردنی ئەو شوێنەی کە یەکەم داوی دۆزینەوەی نهێنیەکەمانی تێدایە، ئەو

شوێنەی کە ئاڵای بەربەرۆسای ئەسڵی لێیە، ئەو شوێنەی کە سەرکێشیەکەمانی لێوە دەست پێ دەکەین بریتیە لە (مۆزەخانەی دەریایی تورکی)، یەکێک لە گەورەترین مۆزەخانە دەریاییەکان لە جیهان، کە دەکەوێتە ناوچەی بێشکتاشی تورکیا، نزیک گۆڕی ئەفسانە خیرالدین بەربەرۆسا!

## سەرەتای چیرۆکەکە

ئەو منداڵێکی بچوک بوو، دەستی پوری گرتبوو؛ بەخێرایی دەڕۆیشت لە یەکەم ڕۆژی خوێندنی ژیانیدا، لە کۆتایدا دەبێتە قوتابی لە قوتابخانەی هیوای سەرەتایی، لە کۆتایدا لەگەڵ منداڵە گەورەکاندا دەبێت لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، دوای ئەوەی ساڵێکی تەواوی لەگەڵ منداڵە بچوکەکان لە باخچەی ساوایان بەسەربرد، بەختەوەری ئەو منداڵە بەشێوەیەک بوو کە وەسف ناکرێت، بەجۆرێک کە هەنگاوەکانی خێراتر بوو لە هەنگاوەکانی پوری کە دەستی گرتبوو، دەترسا دەستی لە دەستی بەربێت.

- پورە خەدیجە بە پێکەنینەوە پێی گوت: لەسەرخۆ نیزال، لەسەرخۆ باوانەکەم!
- خێراکە پورێ خێراکە، پێویستە یەکەم کەس بم بۆ ئەوەی لە پۆل لە کورسی یەکەم دابنیشم، چونکە ئەوانە دەبنە قوتابی زیرەک، بەڵام ئەوانەی لە دواوە دادەنیشن دەبنە قوتابی تەنبەڵ.

پورە خەدیجە پێکەنی و پاشان لە نیزالی پرسی:

- تۆ چۆن بەم نهێنییە ترسناکەت زانیوە؟ ئایە لە باخچەی ساوایان پێیان گوتون؟

- نا پورێ،ئەحمەدی کوڕی دراوسێمان کە لە پۆلی دووەمی سەرەتاییە دوێنێ دوای ئەوەی یاری تۆپی پێمان کرد لەگەڵمان دانیشت و چەند ئامۆژگاریەکی ئەو منداڵانەی کرد کە دەچنە پۆلی یەکەمی سەرەتایی.

- ئەی خودایە! ئەحمەدی کوری سوعاد ئامۆژگاری منداڵان دەکات؟! ئەحمەد دەربارەی ئەو ئەزمونە درێژەی ژیانی قوتابخانەی چیتری پێ گوتن؟

- بەڵی پورێ، من و کوڕانی گەڕەک هەمیشە دوای کۆتایی هاتنی یاری تۆپی پێ لە دەوری ئەحمەد کۆدەبینەوە، گوێ لە چیرۆکە سەرنجڕاکێش و ئامۆژگارییە بەسوودەکانی دەگرین، دوێنێ پێی گوتین: پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە دوو گروپ پێک دێت، پۆلی یەکەم (ا) مامۆستایەکی دڵنەرمی لێیە لە قوتابییەکان نادات، بەڵام پۆلی یەکەم (ب) مامۆستایەکی دڵڕەقی لێیە بەخراپی لە منداڵەکان دەدات، بۆیە پێویستە لەسەرمان (ا) هەڵبژێرین، هەروەها پێیگوتم: دەبێت هەمیشە لە کاتی قسەکردنم لەگەڵ مامۆستاکەم بە (مامۆستا) کۆتایی بە قسەکانم بێنم، هەروەها پێیگوتم: ئەگەر مامۆستایەک ویستی سزام بدات و لەهەردوو دەستم بدات، پێویستە لەسەرم یەک دەستم بکەمەوە تاوەکو لێی بدات، لێدانی یەکەم ئازاری هەیە، بەڵام لێدانی دووەم لە هەمان دەست ئازاری نابێت.

- واز لە ئەحمەدو ئامۆژگاریەکانی بێنە، لێدان لەیاسای قوتابخانە قەدەغەیە، تەنها قوتابیەکی زیرەک بەو ڕێز لە هاوڕێ و مامۆستاکانت بگرە، ئەو کاتە خۆشترین کات لە قوتابخانە بەسەردەبەی، گرنگترین شت ئەمرۆ ئەوەیە ئەم باجە هەڵواسراوەی سەر کراسەکەت ون نەکەی، چونکە وێنەکەت و هەموو زانیاریەکانی قوتابخانەکەتی لەسەرە، تێگەیشتی نیزال؟

- تێگەیشیتم پورێ.

تا زیاتر لە قوتابخانەکەی نزیکتر دەکەوتەوە نیزال هێدی هێدی خۆشحاڵیەکەی زیادی دەکرد، هەروەها زۆر شانازی بە خۆییەوە دەکرد بەهۆی لەبەرکردنی جلە ڕەنگ شینەکەی، قوتابیانی قوتابخانەی سەرەتایی یەک پۆشیان لەبەر دەکرد، ڕەنگەکەی لە قۆناغێک بۆ قۆناغێکی تر جیاواز بوو، قوتابیانی پۆلی یەک ڕەنگی شین و قوتابیانی پۆلی دوو ڕەنگی سوریان لەبەردەکرد، بەڵام پۆلی سێ جلەکانیان ڕەنگی زەرد بوو، ڕەنگی سەوز تایبەت بوو بە قوتابیانی پۆلی چوارەم کە گەورەترین قوتابیانی ئەو قوتابخانە سەرەتاییە بوون، کاتێک نیزال لە ڕێگا بەرەو قوتابخانە دەڕۆیی تێبینی شتێکی سەیری کرد، ئەویش ئەوەبوو، خێرایی قوتابیەکان و ئەدگاری ڕوخساریان گۆڕانی بەسەردادێت بە پێی ڕەنگی ئەو جلەی لەبەری دەکەن، قوتابیانی جل شین خێراترین قوتابی بوون لە ڕێگایان بەرەو قوتابخانە، خۆشحاڵیەکی زۆر لە ڕوخساریان دەبینرا، لەکاتێکدا ئەم خۆشحاڵیە لە قوتابیانی جل سور کەمتر دەبینرا و هێواشتر بوون بەرەو قوتابخانە، هەروەها قوتابیە جل

زەردەکـان هێواشـترین قوتـابی بـوون بەرەو قوتابخـانە، زۆرێکیان لەلایەن کەسوکاریان بەرەو قوتابخـانە ڕادەکێشران و ڕووێکی گرژو مۆنیان هەبوو، قوتابیانی جل سەوز نامۆترین قوتـابی بوون، هەموو نیشانەیەکی مرۆڤایەتیان لە ڕوخسار ون بوو بوو، هەمویان بە هەمان خێرایـی و شـێوازبوون، وەکـو بڵێـی بـوو بـنە کۆمەڵێـک ڕۆبۆتی کـارپێکراو. ئەو کـات نیـزال لە نهێنـی ئەو جیـاوازیە لە خێرایی و شـــــــــێوەی قوتابیەکـــــــــــان تێنەگەیشـــــــت.

پاشان بە ڕوخسارێکی منداڵانەی پاکەوە سەیری پوری کرد و لێی پرسی:

- بۆچی هەموو قوتابیەکـان ڕەنگـی شـین ناپۆشـن بـۆ ئەوەی خێراو دڵگەرم بن لە قوتابخانە؟!

- پورە خەدیجە پێکەنی و بە سۆزەوە سەیری چاوەکانی برازا بچوکەکەی کردو تێگەیشت مەبەستی چییە، بە دەنگێکی بە سۆزەوە پێی وت:

- بچکۆلانەکەم ڕەنگ هۆکار نیە بۆ ئەمە، بەڵکو هۆکاری تری هەیە!

نیـزال لەبەردەم قوتابخـانە ژمـارەیەکی زۆر دایـک و بـاوکی بینـی کە منداڵەکانیان مـاچ دەکـردو خواحافیزیـان لێدەکردن، ئەمـیش هیوای دەخواست وەکو قوتابیەکـانی تـر دایـک و بـاوکی لەم ڕۆژە لەگەڵی بـان، بەڵام پـورە خەدیـجە پێـی گوتبـوو کە دایـک و بـاوکی کۆچی دواییـان کـردووە، لەو کـاتەی ئەم تەمەنـی سـێ سـاڵان بـووە، دوای ئەوە پوری ئەرکی پەروەردەکردنی گرتووەتە ئەستۆ، وەکو منداڵێکی

خۆی بەتایبەت کە پوری هیچ منداڵێکی نەبوو، لە یەکەم ڕۆژی خوێندن نیزال سەرەڕای ئەوەی دایک و باوکی لەگەڵی نەبوون بەڵام بەهاوەڵێتی پووری یەکجار دڵخۆش بوو، دڵخۆشی پوریشی بە گەیشتنی برازا بچکۆلەکەی بۆ قۆناغی سەرەتایی لە دڵخۆشی نیزال کەمتر نەبوو، تەنانەت دوو هەفتەی ڕابردوو خەریکی دۆزینەوەی جانتایەکی ناوازە بوو تاوەکو وەک دیاریەک بەم بۆنەیەوە پێی ببەخشێت.

- پاسەوانی قوتابخانەکە بە دەنگێکی تووڕەوە بە خەدیجەی گوت: بۆ کوێ خانمەکەم؟چونە ژوورەوەی کەسوکار بۆ ناوەوەی قوتابخانە قەدەغەیە.

- بەڵام برازاکەم پۆلی یەکەمی سەرەتاییە و کێشەی دیاریکردنی ئاڕاستەو شوێنەکانی هەیە و نازانێت بچێت بۆ کوێ، بهێڵە لەگەڵی بم تاوەکو پۆلەکەی!

- چونە ژوورەوەی کەسوکار بۆ ناو قوتابخانە قەدەغەیە، ئەمە ڕێنمایەکانی بەڕێوبەرە، مادام باجی هەڵگرتوە پێویست بە نیگەرانی ناکات، مامۆستاکانی بۆ پۆلەکەی ڕێنمایی دەکەن. لەم کاتەدا خەدیجە برازاکەی لە باوەش گرتوو ماچی کرد، بە دوو چاوی پڕ فرمێسکەوە ماڵئاوایی لێ کردوو پێی گوت:

- بچکۆلەکەم شانازیت پێوەدەکەم، تۆ ئەمڕۆ پیاوێکی گەورەیت، چێژ لە یەکەم ڕۆژی خوێندنت ببینە، ئەمە دەبێتە ڕۆژێکی جیاواز لە ژیانت، یادگارییەکەی بە درێژایی ژیانت هەمیشە لە

خەیاڵت دەمێنێتەوە، لە کاتی کۆتـایی هـاتنی دەوامی قوتابخانە لە دەرەوەی قوتابخانە لە هەمان شوێنی ئێستامان چاوەڕێت دەبم.

نیـزال ماڵئـاوایی لە پـوری کـرد و بە گەشـبینیەوە چـوەژوورەوە، لە کاتێکدا زەردەخەنە تەواوی ڕوخساری داپۆشیبوو، بەڵام هەرکە چوە ژوورەوە ئەم زەدەخەنەیە بە زویی ون بوو، نیزال لەم ساتەدا چاوی بە دیمەنێکی سەیر کەوت!

❊❊❊

## ڕۆژێکی لەیادنەکراو

هەرکە نیزال پێی خستە نـاو قوتابخـانەکەی ژمـارەیەکی زۆر قوتـابی بینی، کە لە ژیانی نەیبینیبوون، منداڵەکان لە حەوشەی قوتابخانەکە ڕایـان دەکـرد و هاواریـان دەکـرد کە شـوێنی ئەو ژمـارە قوتـابیە نەدەبویەوە، پێش ئەوەی زەنگ لێبدات دەنگی منداڵەکان شوێنەکەی پڕ کردبوو، هەرکە زەنگ لێیدا چەند مامۆستایەک لە ژورەکان هـاتنە دەرەوەو، هەریەکەیان دارێکی درێژی هەڵگرتبـوو، بەدوای منـداڵەکان ڕایان دەکردو هاواریان دەکرد:

- دەی منداڵەکان، برۆنە ڕیزەکانتان، بـڕۆنە ڕیزەکانتـان، دەی خێراکەن!

دەنگی مامۆستاکان ترسناک بوو، منداڵەکان بەخێرایی و بەناڕێکی بە هەموو لایەکدا ڕایان دەکرد، مامۆستاکان هەر قوتابیاک بکەوتایە، بەردەستیان لێیان دەدا، منداڵەکان بە هەموو لایەکدا ڕایان دەکرد تاکە منداڵ کە وەستابوو سەیری ئەم دیمەنە سەیرەی دەکرد نیزال بوو، ئەو تێنەدەگەیشت بۆچی مامۆستاکان وەکو شێت بەدارەوە بەدوای منداڵەکان ڕادەکەن و هاواردەکەن، نەشیدەزانی مەبەستی مامۆستاکان لە وشەی (بەرەو ڕیزەکانتان) چی یە، بەڵکو هەر نەشیدەزانی ڕیز واتای چی یە!

کاتێک نیزال وەستابوو سەیری ئەم دیمەنەی دەکرد یەکێک لە مامۆستاکان کە شەڕ لە چاوی دەباری بینی و بە خێرایی بەرەو ڕووی هات، نیزال کە ئەو دوو چاوە ترسناکەی بینی لێی نزیک دەبێتەوە، وەکو با لە مەیدانی قوتابخانە ڕایدەکرد و، لەخۆی دەپرسی لە یەکەم ڕۆژی قوتابخانە چی وای کردوە ئەم مامۆستایە لێی تورە بێت، نیزال بەردەوام بوو لە ڕاکردن سەرەڕای ئەوەی چەند جارێک بەر قوتابیەکانی تر دەکەوت کە ڕایان دەکرد، چەند جارێک کەوت، بەڵام دوای هەر کەوتنێک دووبارە هەڵدەستایەوە سەرپێ و دووبارە ڕای دەکردەوە بەبێ ئەوەی بزانێت بەرەو کوێ ڕادەکات، لەم کاتەدا نیزال گوێی لە دەنگێک بوو لە بڵندگۆی قوتابخانەوە هاواری دەکرد:

- سڵاوی نیشتیمانی.

لەم ساتەدا نیزال سەیری کرد کە تەواوی مامۆستا و قوتابیەکان وازیان لە ڕاکردن هێنا، لە چەند چرکەیەکدا قوتابیەکان لە چەند

ڕیزێکی ڕێک وەستان، نیزالیش چوە ناو یەکێک لەم ڕیزان، بێدەنگیەکی نامۆ قوتابخانەکەی داگرتبوو، دواتر میوزیکێکی سەیر ئەم بێدەنگیەی شکاند کە لە بڵندگۆکانەوە دەردەچوو، هەموو قوتابیەکان چەند وشەیەکیان لەگەڵ مۆسیقاکە دەوتەوە، بەڵام نیزال وشەکانی دوبارە نەدەکردەوە، چونکە لەبەری نەکردبوون، دوای ئەوەی سەیرێکی قوتابیەکانی کرد، تێگەیشت کە ئەو تاکە قوتابی نییە وشەکانی سرودی نیشتیمانی لەبەر نەبێت، تێبینی کرد هەندێک لە قوتابیەکان وشەی جیاواز لە سرودەکە دەڵێنەوە، هەروەها هەندێک لە قوتابیەکان وایان پیشان دەدا کە سرودەکە دەڵێنەوە، ڕاستیەکەی بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بڵێنەوە تەنها دەمیان دەجوڵاند، لەم کاتەدا نیزال بیری لەوە کردەوە چ شتێک پاڵ بە هەندێک کەس دەنێت بە دووبارە کردنەوەی هەندێ شت کە لێیان تێناگات تەنها بۆ دڵ ڕاگرتنی ئەوانی تر.

کاتێک سرودی نیشتیمانی تەواوبوو، قوتابیەکانی دەوروبەری بەتورەیەوە سەیری نیزالیان دەکرد، لە سەرەتادا نیزال لەم هەڵسوکەوتەی قوتابیەکانی دەوروبەری تێنەگەیشت، بەڵام سەیری خۆی کرد کە وەک خاڵێکی شین وابوو لە دەریایەکی زەرد، ئەو کات تێگەیشت کە لە شوێنێکی هەڵە وەستاوە، کە شوێنی قوتابیانی پۆلی سێیەمی سەرەتاییە.

- تۆ ئەی شینی بچوک لە ڕیزەکەمان دەرچۆ پێش ئەوەی لێت بدەین.

منداڵەکان لە نیزالیان دەداو پاڵیان پێوە دەنا، نیزالیش دەیویست بچێتە ڕیزی قوتابیە شین پۆشەکان، بەڵام کێشەکە ئەوە بوو ڕیزی قوتابیە شینەکان لەو دوور بوو، قوتابیەکان لە مەیدانەکە کرابونە دوو بەش، بەشێکیان قوتابیانی زەرد و شینی لەخۆ دەگرت کە لە نزیک دەرگای قوتابخانە بوون، بەشەکەیتر قوتابیانی زەرد و سەوزی لەخۆدەگرت، لە ناوەڕاستی قوتابخانەش مامۆستاکان وەستابون کە بەرێوەبەر لە پێشەوەیان بوو، بۆیە نیزال نەیدەتوانی بچێتە بەرەکەی تری قوتابخانە بۆ لای قوتابیە بەرگ شینەکان بەتایبەت کە ئەو مامۆستا تورەیەی بە دارەوە دوای کەوتبوو لە ناوەڕاستی مەیدانەکە وەستابوو، بۆیە نیزال هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی چووە ڕیزی قوتابیە سەوزەکان بەو هیوایەی ئەوان باشترین لەگەڵی، بەڵام لەم ڕیزە نیزال هیچ کاردانەوەیەکی نەبینی نە بەخێرهاتن و نە دەرکردن، نیزال زۆر لە ڕوخساریان ڕاما بەڵام هیچ ڕویەکی مرۆڤ دۆستانەی تێدا بەدی نەکردن، بەڵکو هەمویان وەکو بت بەڕێکوپێکی وەستابوون، دواتر بڵندگۆکە دوبارە بێدەنگیەکەی شکاند و کەسێک هاواریکرد:

- ڕاهێنانی بەیانیان: یەک، دوو، سێ، چوار- یەک، دوو، سێ، چوار...

دەنگەکە لە تەواوی قوتابخانەکە دەنگی دەدایەوە و لەگەڵ هەر جارێک ژماردن قوتابیەکان دەستیان بەرزو نزم دەکردەوەو بەقاچەکانیان دەیان کێشا بەزەویداو چەپڵەیان لێدەدا، قوتابیەکان بە نارێکوپێکی دەستیان بەرزو نزم دەکردەوەو دەنگی پێکەنین لە

نێوان ڕیزەکان بەرزدەبویەوە، تەنیا قوتابیە جل سەوزەکان بوون کە
وەکو ئامێرێک بەرێکوپێکی ئەم ڕاهێنانەیان ئەنجام دەدا، بە
تێپەڕبونی کات مامۆستاکان خێراتر دەبون لە ژماردن و
قوتابیەکانیش خێراییان زیادی دەکرد، بەهۆی جوڵە خێراکانی
قوتابیە سەوزەکان کە زۆر لەو درێژتربوون نیزال چەند جارێک کەوت
و هەستایەوە، ترسا بکەوێتە ژێر قاچیان بۆیە خۆی دایە دواوەی
هەموو قوتابیەکان، لەم کاتەدا نیزال بیری لەوە دەکردەوە بۆچی
کات بە ڕاهێنانی بەیانیان دەکوژن، لە کاتێکدا پێش کەمێک
هەمویان ڕایان دەکرد!

دوای کۆتایی هاتنی ڕاهێنانی بەیانیان، بەڕێوبەر دەستی کرد بە
قسەکردن و ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو، بەبێ ئەوەی نیزال شتێکی
لێ تێبگات، دەنگی بڵندگۆکە بە نارێکی دەهات و زۆر کات
نەدەگەیشتە قوتابیەکان، لە کۆتایدا دەنگەکە بەتەواوی پچڕا،
بەڕێوبەر قسەی دەکرد و هیچ یەک لە قوتابیەکان گوێیان لێ
نەدەبوو، سەرەڕای ئەوەش هیچ قوتابیەک بگرە هیچ مامۆستایەکیش
نوقەی لێوە نەهات و کەسیان بەڕێوبەری داماویان ئاگادار نەکردەوە
کە دەنگی ناگاتە کەسیان، نیزال لەم کاتەدا سەیری ڕوخساری ئەو
مامۆستا و قوتابیانەی دەکرد کە وایان پیشان دەدا گوێیان لە
قسەکانی بەڕێوبەرە، بەتایبەت قوتابیە سەوزەکان کە بە ڕێکی
وەستابون و سەیری بەڕێوبەریان دەکرد، هەرکە بەڕێوبەر قسەکانی
تەواوکرد کەوتنە چەپڵەلێدانێک کە نیزال لە ژیانی شتی وەهای

نەبینیبوو بەتایبەت مامۆستاکان، کە زۆرینەیان گوێیان لە وتەکانی بەڕێوبەر نەبووبوو!

دوای کۆتـایی هـاتنی وتەکـانی بەڕێـوبەر، قوتابیەکـان دەچـوونە پۆلەکانیـان تەنیـا قوتـابیە شینەکان لەگەڵ چەنـد مامۆسـتایەک لە مەیدانەکە مانەوە، ئەو کـاتە نیـزال چووە ڕیزەکانیـان و هەستی بە ئاسودەیی کرد، دوای ئەوەی بەسـەری هـات، لەکۆتـایدا یەکەم ڕۆژی خوێنـدنی دەسـتی پێکـرد، دواتـر دوو مامۆسـتا هـاتن هەریەکەیـان پەڕەیەکی لەدەست بوو، سەیری باجی قوتابیەکانیان دەکرد، پاشان سەیری پەڕەکەی دەستیان دەکردەوە بۆ ئەوەی قوتابیەکـان بکەنە دوو گـروپ، زۆری نەبـرد نیـزال تێگەیشـت یەکێـک لە مامۆسـتاکان هەمان مامۆسـتایە کە دوای کەوتبـوو، بـۆیە چاوەکـانی داخسـت بەو هیـوایەی بکەوێـتە گروپـی مامۆسـتاکەی تـر، دوای چەنـد خولەکێـک تورە هاتە سەر نیزال و مامۆستایەک کە هەمـان مامۆسـتا بـوو دوای کەوتبوو لێـی نزیـک کەوتەوە و سـەیری کراسـەکەی نیزالـی کـردو بە دەنگێکی گڕ لێی پرسی:

- تۆ کێی؟
- نیزال بە دەنگێکـی نـزم و پـڕ لە تـرس وەڵامـی دایەوە: مـن نیزالم مامۆستا.
- نیزال کێ؟
- نیزال بەدەوی مامۆستا

مامۆستا سەیری پەرەکەی بەردەستی کرد و ناوەکانی هەڵدەدایەوە.

- ڕاستە نیزال عبدالجلیل بەدەوی، باجەکەت لەکوێ یە؟

لەم ساتەدا نیزال بۆ یەکەم جار هەستی کرد باجەکەی ونکردوە، بۆیە دەستی بەگریان کردو بە هەناسەی توندەوە گوتی:

- نازانم مامۆستا، باجەکەم لای خۆم بوو مامۆستا، کاتێک هاتمە ناو قوتابخانە بەبێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکم کردبێت تۆ شوێنم کەوتی بە دارێکەوە مامۆستا، بۆیە لەترسی تۆ بەخێرایی ڕامکرد مامۆستا، بەر چەند قوتابیەک کەوتم و چەند جارێک کەوتم و هەستامەوە لە کاتی ڕاکردنم و لە کاتی وەستانم لەنێوان قوتابیانی سەوز و زەرد مامۆستا، لەوانەیە لە یەکێک لەو شوێنانە باجەکەم کەوتبێت مامۆستا.

دوای ئەوەی مامۆستاکەی گوێی لە قسەکانی نیزال بوو، چەند چرکەیەک سەیری کرد و پاشان وتی:

- ڕۆڵە تۆ تەواوی؟ بۆهێندە وشەی مامۆستا دوبارە دەکەیتەوە؟

- نیزال بەردەوام بوو لە گریان گوتی: ئەحمەدی کوڕی دراوسێکەمان کە لە قوتابیە چل سورەکانە پێی وتم کە وشەی مامۆستا زۆر دوبارە بکەمەوە کاتێک قسە لەگەڵ هەر مامۆستایەک دەکەم مامۆستا.

- وادیارە تۆ منداڵێکی زۆربلێی، بڕۆ و بەدوای باجەکەت بگەڕێ، تۆ بەبێ ئەو باجە بۆمن بوونت نییە.

- نیزال بە سەرسوڕمانەوە وتی: بەڵام مامۆستا من هەم، لە بەرامبەرت وەستاوم، ناویشم لە لاپەڕەکەی بەردەستت هەیە!

- ئەو ناوەی لای من هەیە نیزال عبدالجلیل بەدەویە، بەڵام من نازانم ناوی تۆ چییە؟ باجەکەت بون و نەبوونت دیاری دەکات، بڕۆ و بەدوایدا بگەڕێ، بەبێ ئەو باجە ناهێڵم بچیتە پۆلەکەتەوە، ئەوە یاسایە.

دوای ئەوە هەموو قوتابییە شینەکان چونە پۆلەکانیان تەنیا نیزال لە حەوشەکەدا مایەوە، لە دڵی خۆیدا بەدوای واتای کۆتا وشە کە مامۆستا پێی گوت دەگەڕا، وشەی (یاسا)، پوریشی پێشتر هەمان وشەی پێ گوتبوو، کە لێدان بەپێی یاسا لە منداڵان قەدەغەیە، ئێستاس مامۆستا پێی دەڵێت بەپێی یاسا بەبێ باج ناتوانێت بچێتە پۆلەکەی، بەڵام هەمان مامۆستا کە دەیەوێت یاسا جێبەجێبکات بەیانی یاسای دەشکاند و بە دارێکەوە بەدوای قوتابییەکان کەوتبوو بۆ ئەوەی لێیان بدات، لەم کاتەوە نیزال تێگەیشت کە یاسا بریتییە لە: کۆمەڵە کارێک کە هەندێکی جێبەجێ دەکرێت و هەندێکی دەشکێنرێت، ئەوە خودی مامۆستایە کە دیاری دەکات دەبێت کام یاسا جێبەجێبکرێت و کامی نابێت جێبەجێبکرێت، مامۆستا خۆی واتای یاسا دیاری دەکات!

نزیکەی نیو کاتژمێر نیزال لە حەوشەی قوتابخانەکەی بەدوای باجەکەی دەگەڕا، بەڵام هیچ شتێکی نەدۆزیەوە، لەکاتی گەڕانی لە باجەکەی نیزال بیری لەوەدەکردەوە چۆن دەکرێت پارچە کاغەزێک بوون و نەبونی دیاری بکات؟! دوایی ئەوەی نیزال لە گەڕان ماندوبوو، بەتەنیایی لە حەوشەی قوتابخانەکەی دانیشت و پاڵیدا بەو ئاسنەی ئاڵاکەی ڕاگرتبوو، جانتا جوانەکەشی کە پوری بۆی

کردبوه دیاری هێناو کردیە چەتری سەری تا لە گەرما بیپارێزێت کە تا دەهات تینی زیادی دەکرد، نیزال سەری سوڕما لەوەی زۆرێک لە مامۆستاکان بە تەنیشتی تێپەڕ دەبن، بەبێ ئەوەی لێی بپرسن بۆچی بەتەنیایی لە حەوشەی قوتابخانە دانیشتووە! دوای ئەوەی ڕۆژەکە تەواو گەرم بوو، نیزال بیری لەوەکردەوە کە بگەڕێتەوە ماڵەوە، بۆیە بەڕێکەوت بۆ ماڵەوە بەڵام تەنانەت پاسەوانی قوتابخانەکەش کە نەیهێشت پوری بێتە ژورەوە لێی نەپرسی بۆچی بەتەنیایی دەچێتە دەرەوە!

ڕاستیەکەی کێشەکە لە دووری ڕێگای شوقەکەیان نەبوو چونکە تەنیا پێنج خولەک ڕێگا بوو، بەڵام کێشەکە ئەوەبوو نیزال بەدەست پەشێویەکی دەرونیەوە دەیناڵاند کە بە زانستیانە پێی دەوترێت (کەم هۆشی فرە جوڵە ADHD)، ئەم پەشێویە وا لە خاوەنەکەی دەکات شتەکانی بە قورسی بێتەوە یاد و دیقەتی بڕوات، بۆیە نیزال بە قورسی ئاڕاستەکانی دیاری دەکرد و ڕێگاکانی دەهاتەوە یاد، ئەو کاتەی لە ڕێگا دەڕۆیی یان لەگەڵ کەسێک قسەی دەکرد زۆرجار لە دونیای خۆی نوقم دەبوو، هەر لەبەر ئەمەبوو زۆرجار لە بازاڕ لە پوری ون دەبوو، سەرەڕای ئەوەی نیزال ئاگاداری حاڵی خۆی بوو، بەڵام بڕیاری دا بەتەنیا بچێتەوە ماڵەوە، نیزال سەرەڕای هەموو ئەوانەی ڕویدا گەشبین بوو پێی وابوو هەموو ئەوەوی دەیەوێت باجێکە کە بوونی بسەلمێنێت، نیزال دەیزانی کە پورە خەدیجەی لە ماڵەوەیە و پێی وابوو پوری دەتوانێت بەزویی باجەکەی بۆ دروست بکات تا بگاتەوە یەکەم ڕۆژی خوێندنی، چونکە ئەمە ڕۆژێکی جیاواز

بوو بۆ ئەم و یادگاریە جوانەکانی بەدرێژایی ژیان لە یادی دەمێنێتەوە، وەکو پوری پێی وتبوو!

نیزال بەرەو ماڵەوە کەوتەڕێ و جانتا قورسەکەشی دابوو بەکۆڵی کە نەیدەزانی چی تێدایە، هەرزوو قاچە بچوکەکانی ماندوبوون، سەرەڕای ماندوبوون و تینوێتی بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، بەڵام دوای دە خولەک ڕۆیشتن شوقەکەیان هەر دەرنەکەوت، نیزال تێبینی ئەوەی نەکردبوو کە لە جیاتی ئەوەی بەرەو ڕۆژهەڵات بڕوات کە شوقەکەیانی لێیە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆیشت کە بەرەو بیابان بوو!

***

## ڕاکە ڕاکە

نیزال لە بیابان بەوپەڕی خێرایی ڕایدەکرد و دەنگی وەڕینی سەگ تا دەهات بەرز و بەرزتر دەبویەوە تا نزیکتر دەکەوتەوە لێی، سەرەڕای ئەوەی لەبەر ترسی زۆری ئاوڕی دواوەی نەدەدایەوە، بەڵام نیزال دڵنیابوو سەگەکە دەیگرێت، هەرچەند خێرا بڕوات، دەیزانی لە چەند چرکەی داهاتوو ڕوبەڕوی ئەو سەگە دەبێتەوە، لەم کاتەدا نیزال چیرۆکێکی بیرکەوتەوە کە لە ئەحمەدی کوڕە دراوسێیان گوێی لێبوبوو، ڕۆژێکیان ئەحمەد بۆ منداڵانی گەڕەکی باس دەکرد چۆن منالێک لە گەڕەکەکەی تەنیشتیان نەیتوانیوە بۆ ماوەی ساڵێک لەسەر کورسی دابنیشێت بەهۆی ئەوەی سەگ قەپی لێگرتبوو، هەروەها ئەو منداڵە بەهۆی قەپی سەگەکەوە تاوەکو دوو ڕۆژ دەوەڕی!

هەروەهـا دەیگـوت ئەو منـداڵە وازی لە وەڕیـن نەهێنـا تـاوەکو دکتۆرەکـان دەرزیەکیـان لێدا کە درێـژیەکەی نیـو مەتـر بـوو، ئەم دەرزیە وایلێکـرد تـا چەنـد ڕۆژ هاواربکـات و بناڵێنێـت، لەم کاتەدا نیزال خەریک بوو وەکو باڵندە بفڕێت، لە ترسـان دەیەویست هەموو ئەو شتانە بهێنێتەوە خەیاڵی خۆی کە ئەحمەد بۆی باس کردبوون، نیـزال ئامۆژگـاری یەکێـک لە منـداڵەکانی بیـرکەوتەوە کە لەکۆتـایی قسـەکان پێیگـوتن کە سـەگ تەنیـا قەپ لەو کەسـانە دەگرێـت کە ڕادەکەن و باشـترین ڕێگـای بەرگریکـردنیش ئەوەیە کە ڕانەکەی و ترسەکەت بشاریتەوە، ئەگەر سـەگ لێشـت نزیـک کەوتەوە بەنەرمی دەست بەسەر پشتیدا بهێنیت.

لەم کاتەدا نیزال بڕیاری دا ئەم ڕێگایە تاقیبکـاتەوە، بـۆیە لەناکاو لەڕاکـردن وەسـتاو بەرەو ڕوی سـەگەکە سـوڕا و لە دووری چەنـد مەترێـک لە بەردەمیـدا سـەگێکی گەورەی بینـی ، وەکـو ئەو سـەگە گەورانەی نیـزال لە ئەفـلام کارتۆنەکـان بینیبـوی، نیـزال لە ترسان دوبـارە بیـری لە ڕاکـردن کـردەوە، بەڵام خـۆی کـۆنترۆڵ کـرد و لە شوێنی خۆی مایەوە، کاتێـک سـەگەکە تەنیـا کەمێکـی مـابوو بگاتە نیزال لە ناکاو کەمێـک ئـارام بـویەوە، نیـزال سـەیری کـرد و لەسەر چۆک دانیشت و بە ئارامی پێی وت:

-

وەرە سـەگی جـوان، وەرە!

سەگەکە بە هێواشی بەرەو نیزال دەهات و جارێـک بەدەوریـدا سوڕا، هەرچەنـدە لە وەڕیـن وەسـتابوو بەڵام دەنگـی هەناسـەکانی هێشتا

ترسناک بوو، دووباره نیزال بیری له ڕاکردن کردەوە بەڵام بیریکەوتەوە کە منداڵەکەی گەڕەکی تەنیشتیان چی بەسەرهاتبوو، بۆیە خۆی کۆکردەوە و بە هێواشی لێی نزیک کەوتەوە و دەستی بەسەر پشتیدا دەهێنا و دەیگوت:

- سەگی جوان.... سەگی جوان.

دوای ئەوە سەگەکە لە نیزال دورکەوتەوە و نیزال لە شوێنەکەی هەستاو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو و بەردەوام ئاوڕی بەلای سەگەکە دەدایەوە، تاوەکو لەچاوی ونبوو.

لەم کاتەدا، تینوێتی زۆری بۆ نیزال هێنابوو، بەڵام ترس بە شێوەیەکی کاتی ئەمەی لەبیر بردبوویەوە، هەرکە سەگەکەی لێ ونبوو دووبارە هەستی بە تینوێتی کردەوە بەتایبەت کە ماوەیەکی زۆر ڕایکردبوو بەبێ ئەوەی هەست پێبکات، دوای ئەوەی نیزال گردێکی لمی تێپەڕاند کە هاتە ڕێگای، چەند باڵەخانەیەکی نیشتەجێبونی بینی لە دورەوە، بەرەو ڕووی ڕۆیشت، هەرکە گەیشتە باڵەخانەکان، لەم ڕێگا بەرەو ئەو ڕێگا دەڕۆیی بەو هیوایەی ماڵەکەی خۆیان بدۆزێتەوە، لەم کاتەدا لە ناکاو ئۆتۆمبێلێک بەخێرایی بەرەو ڕووی هات و خەریک بوو پانی بکاتەوە، پێش ئەوەی لە بەردەمی بوەستێت، نیزال لەبەردەم سەیارەکە لە ترسی ئەم دیمەنە کەوتە سەرزەوی، هەرچەندە ئۆتۆمبێلەکە بەری نەکەوت بوو بەڵام هەستی بە سەر سوڕان و ماندوێتی دەکردو حەزی دەکرد چاوەکانی دابخات، پێش ئەوەی چاوەکانی بەتەواوی دابخات خانمێک لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و هاواری کردو پێی گوت:

ئەی منداڵی لاسار، چۆن ئاوا بەبەردەم ئۆتۆمبێلەکاندا دەڕۆی؟ خەریک بوو ئۆتۆمبێلە تازەکەم خراپ بکەیت، پەیوەندی دەکەم بە پۆلیس تا بتخەنە بەندیخانە!

هەرکە نیزال گوێی لە هەڕەشەی خانمەکە بوو، دووبارە هەستی کرد خوێن لە دەمارەکانی هاتوچۆ دەکەن و سەرەسوڕەکەی نەما، ڕاستەوخۆ هەڵسایەوەو دەستی بە ڕاکردن کرد، نیزال دەترسا بکەوێتە بەندیخانە، بەتایبەت دوای ئەو چیرۆکەی لە ئەحمەدی کوڕی دراوسێیان گوێی لێببوو، ئەحمەد پێی گوتبوو یەکێک لە باپیرەکانی دەکەوێتە بەندیخانە، کاتێک منداڵێکی بچووک بووە و لە بەندیخانەدا دەمێنێتەوە بۆ ماوەی ١٠٠ ساڵ، کاتێکیش ئازاد دەبێت پرچی درێژو سپی بووە، بۆیە نیزال دەترسا هەمان چارەنوسی باپیرەکەی ئەحمەدی بەسەردا بێت، ئەوەی ترسەکەی زیاد دەکرد دەنگی ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن بوو لە دوورەوە، ئەو پێی وابوو کە ئەوە ئۆتۆمبێلی پۆلیسەو بۆ گرتنی هاتووە، بۆیە بەپەلە لە نێوان باڵەخانەکان خۆی شاردەوە و لە باڵەخانەیەک بۆ باڵەخانەیەکی تر ڕای دەکرد بۆ ئەوەی خۆی لە چاوی پیاوانی پۆلیس بشارێتەوە، نیزال پێی وابوو لە هەموو ڕێگاکان بڵاو بوونەتەوە و بە دوایدا دەگەڕێن، ئەو کاتە نیزال نەیدەزانی کە قسەکانی ئەو خانمە تەنها ڕێگایەک بوو بۆ ئەوەی هۆشی نیزال بگەڕێتەوە، دوای ئەوەی بیبزوێنێت بۆ ئەوەی لە هۆش خۆی بچێت، بۆیە هەوڵیدا بە ئەنقەست دەگوترێت: هۆرمۆنی ئەدرینالین، ئەم هۆرمۆنە ئەو کاتە لەلەشدا مادەیەک لە لەشی چالاک بێت کە پێی

بڵاو دەبێتەوە کە لەش هەست بە بوونی مەترسیەک بکات، کە ئەمە ئەو وزە زۆرەی پێدا دوای گوێبیستبوونی هەڕەشەکانی ئەم خانمە، ئەمە ئەوەبوو کە پورە خەدیجەی دواتر بۆی ڕونکردەوە!

دوای ڕاکردن بۆ ماوەی چارەکێک بەبەردەوامی، نیزال لە ڕاکردن وەستا، دوای ئەوەی خەریک بوو لەبەر تێنویێتی و ماندوبون بکەوێت، سەرەڕای ئەوە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن بە هێواشی، لەکاتێکدا لەم حاڵە پەرێشانەدا بوو، دوکانێکی بچوکی بەدیکرد لە نزیکیەوە و، بەرەو ڕووی چوو بۆئەوەی ساردییەک بخواتەوە، تاوەکو تێنویەتیەکەی بشکێ، نیزال هەندێک پارەی پێ بوو کە پورە خەدیجەی پێیدابوو بۆئەوەی شتی پێ بکڕیت لە قوتابخانە.

- سڵاو مامە، شەربەتت هەیە بە تامی پرتەقاڵ؟ نیزال پرسیاری لە خاوەنی دوکانەکە کرد کە خەریکی ڕێکخستنی شتومەکەکانی بوو.

- خاوەن دوکانەکە بەبێ ئەوەی سەیری بکات وەڵامی دایەوە:

لە ساردکەرەوەکەی دواوەتە

نیزال ساردکەرەوەکەی کردەوەو شەربەتێکی هەڵگرت، دەستی بۆ گیرفانی برد تا پارەکەی بدات بەڵام گیرفانی خاڵی بوو، دوای ئەوە نیزال دووبارە ساردکەرەوەکەی کردەوە بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات شەربەتەکەی گێڕایەوە شوێنی خۆی و ویستی بچێتە دەرەوە لە دوکانەکە.

- بۆ کوێ منداڵە بچکۆلەکە؟! بۆچی شەربەتت نەکڕی؟
- مامە وا دیارە پارەکەم ونکردوە، خودا حافیز.

- چـــاوەڕێ بە! ســـــاتێک چـــاوەڕێبە بچکـــۆلەکەم!
فرۆشیارەکە دوای ئەوەی حاڵی پەرێشانی نیزالی بینی، شتەکانی دەستی داناو لێی نزیک کەوتەوە، ڕاستەوخۆ کورسییێکی بۆ داناو شەربەتێکی ساردی بۆ هێنا.
- لێرە دانیشە کوڕەکەم، ئەم شەربەتە بخۆ لەوەی دەتویست باشترە.
- مامە بەڵام پارەکەم ونکردوە.
- کێشـــە نــیە ئەمە بـا دیـاری بێـت لە مـنەوە، بیخـۆرەوە کوڕەکەم.
- پــێش ئەوەی نیــزال لەســـەر کورســـیەکە دابنیشــێت، شــەربەتەکەی هەمــوو بە جارێــک خــواردەوە، خــاوەنی دوکـانەکە پەرداخێــک ئـاوی ســارد و پــارچەیەک شــیرینی بـۆ هێنـاو بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:
- تۆ کێی بچکۆلانەکەم؟ پێشـتر لێـرە نەمبینیـوی! ماڵتان لە کوێیە؟
نیزال ناوی خۆی پێ وت، هەروەها ڕوداوەکانی ئەم بەیانیەی بۆ باسکرد کە لە قوتابخانە بە سەری هاتبوو، هەروەها بۆی باسکرد کە ڕێگای ونکردوە.
- نیگەران مەبە، ئێستا پەیوەندی بە کەسوکارتەوە دەکەم، نیزال، پێم بڵێ: ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەوەتان چەندە تا پەیوەندیان پێوە بکەم؟
- ژمارەی تەلەفۆنم لەبەر نییە.

- کەواتە ناونیشانی ماڵەوەتانم پێ بڵێ، تاوەکو بتگەیەنمەوە ماڵەوە.

- نازانم.

- ناوی قوتابخانەکەت چیە؟

- نیزال سەری باداو گوتی: نازانم.

- کێشە نیە کوڕەکەم، کێشە نییە، ئێستا پەیوەندی بە پۆلیسەوە دەکەم ئەوان یارمەتیمان ئەدەن بۆ ئەوەی بگەیتەوە بە خێزانەکەت.

هەر کە نیزال گوێی لە وشەی پۆلیس بوو لەسەر کورسیەکە بازیدا و جانتا قورسەکەی لەسەر زەوی هەڵ گرت و، وەکو هەورە بروسکە لە دوکانەکە چووە دەرەوە!

***

## ژمارەی قەدەغە

دوای تێپەڕبونی دوو هەفتە بەسەر ساڵی خوێندنی تازە، لەکۆتایدا نیزال توانی بچێت بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی و ناچاربوو ئەو هەموو ماوەیە چاوەڕێبکات تاوەکو باجێکی تازەی بۆ دروست بکەن و بتوانێت پێی بچێتە پۆلەوە، هەموو ئەو ماوەیەش بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستا تاوەکو لەگەڵ پوری بچێتە وەزارتی پەروەردە بۆئەوەی باجێکی تازەی بۆ دروستبکەن، لەم ماوەیەشدا مێردی پوری بەردەوام لەسەر ونکردنی باجەکەی سەرکۆنەی دەکرد و بۆی باسدەکرد چۆن بۆتە هۆی ئەوەی نیوەی پارەی کارکردنی ڕۆژەکەی

لەدەست بچێت لە ڕۆژی یەکەمی خوێندنی دوای ئەوەی پۆلیس
پەیوەندی پێوەدەکەن بۆ وەرگرتنەوەی نیزال دوای ئەوەی لەلایەن
پۆلیسەوە لە نیوەڕۆدا دۆزرایەوە کە لە سێبەری دارێکدا لە باخێکی
گشتی خەوتبو، هەرچەندە نیزال تەنیا کورسیەکی تەنیای دواوەی
دەستکەوت تا لەسەری دابنیشێت، بەڵام هێشتا دڵخۆش بوو کە
توانی لە کۆتایدا وەکو قوتابیەکانی تر بچێتە قوتابخانە، بەوە
دڵتەنگ نەبوو کە بە تەنها لەدواوەی هەموو قوتابیەکان دادەنیشت
بەڵکو بە پێچەوانەوە بەوە دڵخۆشبوو، چونکە لە یەکەم ڕۆژەوە بۆی
دەرکەوت کە ئەمە ڕوبەرێکی زیاتری ئازادی پێدەدات تا چی بیەوێت
بیکات، بەبێ ئەوەی مامۆستا یان قوتابیەکان ئاگایان لێبێت، لە
کاتێکدا ئەو دەیتوانی هەموو ئەو شتانە ببینێت کە قوتابیەکانی تر
دەیانکرد، هەندێک جار کە مامۆستا خەریکی ڕێکخستنی کورسیەکان
بوو هەر قوتابیەک لە شوێنی خۆی لەتەنیشت قوتابیەکی تر
دادەنیشت بەڵام نیزال دڵخۆش بوو کە بەتەنها لە کورسیەکی گەورە
دادەنیشت و کەس لە کاتی نوقم بون لە دەریای خەیاڵاتی بێزاری
نەدەکرد.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، زیرەکی نیزال لەچاو ئەوانی تر دەردەکەوت،
بەتایبەت لە وانەی بیرکاری، کە نیزال زۆر حەزی لێبوو، بەتایبەت
ئەم وانەیە پێویستی بە لەبەرکردنێکی زۆر نەبوو کە خاڵی لاوازی
ئەم بوو، لە کاتێکدا ئەوانی تر پێویستیان بە قەڵەم و پەڕبوو تا
پرسیارەکانی کۆکردنەوە و لێدەرکردن شیکار بکەن کە مامۆستا لێی
دەپرسین، نیزال ئەم کردارانەی لە مێشکی ئەنجام دەداو پێش

تەواوی قوتابیەکان دەگەیشتە وەڵامی ڕاست، ئەمەش وای کردبوو ببێتە خۆشەویستترین قوتابی لای ئەو مامۆستا تورەیەی کە تەواوی قوتابیەکانی تر لێی دەترسان، هەمیشە مامۆستاکەی زەردەخەنە لەسەر لێوی بوو کە نیزال بە زوویی وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، ئەم پەیوەندیە دۆستانەیە بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژە هات کە پێوەندی ئەم مامۆستایەی لەگەڵ باشترین قوتابی گۆڕی!

بەپێی مەنهەجی قوتابخانە پێویست بوو قوتابیانی پۆلی یەکەم لە ژمارە ١ تاوەکو ١٠٠ لەبەر بکەن، مامۆستا هەمیشە ئەو ژمارانەی دەژمارد لە سەرەتای هەموو وانەیەک کە هەمیشە لەوانەکانی یەکەم بوو، پێویست بوو لەسەر قوتابیەکان کە یەک یەک لەدوای مامۆستا ژمارەکان بڵێنەوە، لەسەرەتادا ئەمە بۆ نیزال کارێکی چێژبەخش بوو، بەتایبەت کە قوتابیەکان کێبڕکێیان بوو کامیان بەرزتر لەدوای مامۆستا بیڵێتەوە، بەڵام دوای تێپەڕبونی نزیکەی چوار مانگ لە دوبارەکردنەوەی هەمان شت، ئەمە بوە شتێکی بێزارکەر لای نیزال، هەمیشە لەخۆی دەپرسی: نهێنی ئەم جۆرە فێرکردنە چییە؟! لە کاتێکدا قوتابیەکان پێدەکەنین و چەپڵەیان لێدەدا دوای تەواوبوون لە گوتنەوەی کۆتا ژمارە کە ١٠٠ بوو لەدوای مامۆستا، نیزال لەخۆی دەپرسی ئەو ژمارەیەی لەدوای ١٠٠ دێت چ ژمارەیەکە، نیزال حەزیدەکرد ژمارەیەکی تازە فێربێت لە جیاتی دوپاتکردنەوەی هەمان ژمارە هەموو ڕۆژێک، لە یەکێک لە ڕۆژەکان لە کاتێکدا کە قوتابیەکان چەپڵەیان لێدەدا و پێدەکەنین دوای گوتنەوەی ژمارە ١٠٠ لە دوای مامۆستاکەیان کە بەدڵخۆشیەوە سەیری دەکردن،

دەنگێک لە کورسیەکانی دواوە هات و هەموو ئەو پێکەنین و دەنگە دەنگەی بڕی:

- مامۆستا دوای ژمارە ١٠٠ چ ژمارەیەک دێت؟!

هەرکە نیزال ئەم پرسیارەی کرد، هەموو قوتابیەکان وازیان لە چەپڵەلێدان و پێکەنین هێنا چونکە ڕانەهاتبون لەسەر بیستنی ئەم جۆرە پرسیارانە، بێدەنگیەکی سەیر پۆلەکەی داگرت، لە ئەنجامی ئەو پرسیارە ترسناکەی گوێبیستی بوون، پاشان مامۆستا لەسەر کورسیەکەی هەڵساو شوێنەواری شۆک بەسەر ڕوخساریەوە دەبینرا، مامۆستا چاوێکی بەناو قوتابیەکاندا گێڕا، پاشان بە تورەیەوە پرسی:

- کێ بوو ئەم پرسیارە گەمژەیەی کرد؟

نیزال لەسەر کورسیەکەی هەستا و بە دەنگێکی منداڵی پاکەوە وەڵامی دایەوە:

- مامۆستا من بووم نیزال بەدەوی.

- نیزال، تۆ قوتابیەکی زیرەکیت، ئەگەر قوتابیەکی تر ئەم پرسیارە گەمژەیەی پرسیبا سزام دەدا، پابەندبە بەوەی من فێرت دەکەم، تەنیا ئەوە لە تۆ و هاوڕێکانت داواکراوە، ئێوە منداڵانێکی بچوکن لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی و بەپێی مەنهەجی قوتابخانە تەنیا پێویستە لەسەرتان لە ژمارە ١ تاوەکو ١٠٠ بژمێرن، ئەوە سنوری ئێوەیە و نابێت بیبەزێنن، ژمارەی تر هەن کە پێویست ناکات ئێوە فێریبین چونکە گەورەترە لە توانا و تێگەیشتنی ئێوە و لەوانەیە ئەم ژمارانە بیرکردنەوەتان ئاڵۆز بکەن، تەنیا ئەو ژمارانە

دوباره بکەنەوە کە من بەیانیان بۆتان دەڵێم تاوەکو لە کۆتایی ساڵ دەربچن و سەرکەوتوبن، تێگەیشتن منداڵەکان؟

- منداڵەکان بە یەک دەنگ وەڵامیان دایەوە: تێگەیشتین ماموستا.

نیزال بەسەرسوڕمانەوە سەیری هاوڕێکانی کرد کە ڕەزامەندیان لەسەر وتەکانی ماموستا پیشان دەدا لە کاتێکدا کە لێی تێنەدەگەیشتن، دوای ئەوە قوتابیەکان خەریکی گوێگرتن بوون لە ماموستاکەیان، بەڵام نیزال بە درێژایی ئەو ڕۆژە بێدەنگ بوو، هەوڵیدەدا لە وتەکانی ماموستاکەی تێبگات، دوای کۆتایی هاتنی دەوامی قوتابخانە، نیزال بەپەلە بەرەو لای پوری چوو، کە لەدەرەوەی قوتابخانە چاوەڕوانی بوو، کاتێک لە ڕێگا بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتن نیزال سەیری پوری کرد و پرسی:

- پورێ، دوای ژمارە ١٠٠ چ ژمارەیەک دێت؟

- ئەو پرسیارە سەیرە چی یە نیزال؟ مەگەر بڕیار وانەبوو لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی تەنیا ژمارە ١ تاوەکو ١٠٠ فێربن؟

- دەزانم پورێ، ئەوە دەزانم، بەڵام ئەو ژمارەیە چەندە لەدوای ژمارە ١٠٠ دێت؟!

- نیزال ئایە ئەم پرسیارەت لە ماموستاکەت کرد؟

- بەڵێ پرسیم، بەڵام لە جیاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەم، قسەیەکی کرد کە من لێی تێنەگەیشتم، هەموو ئەوەی دەمەوێت بزانم ئەوەیە لەدوای ژمارە ١٠٠ چ ژمارەیەک دێت؟!

پورە خەدیجەی لە ڕۆیشتن وەستاو بەسۆزەوە سەیری برازاکەی کرد و پێی وت:

- باش گوێم لێبگرە بچکۆلانەکەم، هەندێک شت هەن لەم دونیایە گەر بیانزانین لەلایەن کەسانی دیکەوە کێشەمان بۆ دروست دەکرێت، ئەو کەسانە هێندە دەسەڵاتیان هەیە کە بۆمان دیاری بکەن پێویستە چی بزانین و چیش نەزانین، بۆیە ئەوان هەست بە سوکایەتیەکی گەورە دەکەن ئەگەر کەسێک فێری شتێک ببێت کە ئەوان ڕێگەیان بە فێربونی نەدابێت، بۆیە دژ بەهەر کەسێک پێچەوانەی ویستی ئەوان بجوڵێتەوە یاخود تەنانەت پێچەوانەی ئەوان بیربکاتەوە شەڕ ڕادەگەیەنن، بۆیە باشترە پرسیار لەبارەی ئەو شتانە نەکەی، وەکو ئەوانی تر بە تاوەکو ژیانێکی ئارام بژیت.

- پورێ ئەگەر شتێک لەو شتانە بۆ خۆم فێربیم بەبێ ئەوەی پرسیار لەو کەسانە بکەم؟

- لەم کاتەدا وریابە ئەو شتەی فێری بویت بەرانبەر ئەوان باسی نەکەی، تەنیا بۆخۆت با بیزانی، یان زۆر بە سادەیی ئەوە لەبیرکە کە فێری بویت، وەکو ئەوانی تر لەگەڵ شەپۆلەکان برۆ، ئەمە باشترە لەوەی لەگەڵ کەسانێک کە زۆر لەخۆت بەهێزترن جەنگ بکەی.

- بەڵام پورێ، تۆ هەمیشە پێتدەگوتم تەنیا ماسی مردوو لەگەڵ شەپۆلەکان مەلەدەکات؟!

- بچکۆلەکەم هەموو ئەوەی دەیڵێین مەرج نیە شیاوی جێبەجێکردن بێت، هەندێکجار کۆمەڵێک دەستەواژەی نمەنەیی

دوباره دەکەینەوە تەنها لەبەرئەوەی دەستەواژەی جوانن، بەڵام کاتێک دێینە سەر جێبەجێکردنی دەبینین ئێمە زۆر لەوە لاوازترین ئەمانە جێبەجێبکەین.

خەدیجە ئەم دەربڕینەی کۆتایی بە ئاوازێکی غەمگین گوت و دوای ئەوە بێدەنگ بوو، وەکو ئەوەی شتێکی رابردوی بیرکەوتبێتەوە، لەرێگادا نیزال تێبینیکرد پوری هەوڵیدەدا فرمێسکەکانی بشارێتەوە کە لەژێــــر تیشــــکی ڕۆژدا بریســــکەیان دەهــــات.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، قوتابیەکان هەر ئەو ژمارانەیان دووبارە دەکردەوە کە مامۆستا دەیگوت، نیزالیش یەکێک بوو لەو قوتابیانە، سەرەڕای ئەوەی باوەڕی بەم کارە نەبوو، هەمیشە ئەم پرسیارە ماخۆلانی مێشکی بوو، بەڵام هەموو کات ئامۆژگاری پوری لەخەیاڵدا بوو کە دەیزانی چەندی خۆشدەوێ، نیزال هەمیشە لە کێشمەکێشێکی ناوەکی دابوو لە نێوان خۆشەویستی فێربوون و ترس لە دەرئەنجامەکانی ئەو فێربونە، بەتێپەڕبونی ڕۆژگار ئەم کێشمەکێشە توندتربوو، پێی وابوو کە پێویستە ئەو ژمارەیە فێربێت کە بە درێژایی کات خەیاڵی داگرتوە، بیریکردەوە دووبارە ئەم پرسیارە لە پوری بکاتەوە، بەڵام فرمێسکەکانی پوری لە جارەکەی تر بیرکەوتەوە کە هۆیەکەی نەدەزانی، بۆیە بڕیاریدا جارێکیتر ئەم بابەتە لەگەڵ پوری نەکاتەوە، بۆیە نیزال بیریکردەوە ئەم پرسیارە لە مێردی پوری بکات بەڵام وازی لەم بیرۆکەیەش هێنا، چونکە زۆر لێی دەترسا و وا هەستی دەکرد کە هەرگیز گرنگی بە هەست وسۆزی نادات، لەکۆتایدا نیزال بڕیاری دا ئەم پرسیارە لەو کەسە

بکات کە باوەڕی بە خۆی و زانیاریەکانی هەبوو، ئەو کەسەش ئەحمەدی کوڕە دراوسێکەیان بوو، بەتایبەت کە ئەحمەد قوتابی پۆلی دووەمی بنەڕەتی بوو، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەزانێت ئەو ژمارەیە کامەیە کە لەدوای ژمارە ١٠٠ دێت، بۆیە نیزال چاوەڕێ بوو تاوەکو ئەحمەد دانیشتنی ڕۆژانەی لەگەڵ منداڵەکان کۆتایی هات پاشان ئەو پرسیارەی لێکرد.

بەیانی ڕۆژی دواتر، قوتابیەکانی پۆلی یەکەم ڕۆژەکەیان دەستپێکرد بە وتنەوەی ژمارە ١ تاوەکو ١٠٠ لەدوای مامۆستاکەیان، دوای کۆتایی هاتنی ژمارە ١٠٠ قوتابیەکان دەستیانکرد بە چەپڵەو پێکەنین، لەناکاو گوێیان لەدەنگێک بوو ئەو ئاهەنگە ڕۆژانەیەی تێکدا:

- سەد و یەک! (١٠١)

لەم ساتەدا، هەموو قوتابیەکان بەلای کۆتا کورسی پۆل ئاوڕیان دایەوە چونکە هەموو قوتابیەکان خاوەنی ئەو دەنگە منداڵانەیان دەناسی، لەکاتێکدا مامۆستا بە بێدەنگی وەستابوو، دوای چەند چرکەیەک لە بێدەنگی کە پۆلەکەی تەنیبوو، مامۆستا لەسەر کورسیەکەی هەستا و ئاگر لە چاوەکانی دەباری و هاواریکرد:

- نیـــــــــزال بەدەوی.... وەرە ئێـــــــــرە!

نیزال بەهێواشی بەرەو مامۆستا چوو و قوتابیەکانیش سەیریان دەکرد، مامۆستا دارەکەی بەرزکردەوە و بە نیزالی گوت: دەستەکانی بکاتەوە تاوەکو سزای خۆی وەربگرێت، بەبێ ئەوەی بۆی ڕوونبکاتەوە، چی وایکردوە شیاوی ئەو سزایە بێت، نیزال دەستی ڕاستی کردەوە تاوەکو مامۆستا لێیبدات، پاشان مامۆستا دارەکەی

بەرزکردەوە تاوەکو ئەم جارە بیکێشێت بەدەستی چەپی، بەڵام نیزال ئەوەی بیرکەوتەوە کە ئەحمەد لەسەرەتای ساڵ پێی وتبوو، بۆیە دوبارە دەستی ڕاستی کردەوە تا مامۆستا دوبارە لێی بداتەوە، مامۆستا دوبارە کێشای بەدەستی ڕاستی و نیزال هەستی پێی نەکرد، هەرکە نیزال گەڕایەوە سەر کورسیەکەی، هەستی کرد پەنجەکانی توانای گرتنی قەڵەمیان نییە، پەنجەکانی دەستی ڕاستی سورهەڵگەڕابون و بۆ ماوی کاتژمێرێک نەیدەتوانی بیانجوڵێنێت، بۆیە بڕیاریدا لە جارەکانی داهاتوو سزاکەی لەسەر دەستی چەپی وەرگرێت!

بەیانی ڕۆژی دووەم، قوتابیەکان سەریان سوڕما کە نیزال سەرەڕای ئەوەی دوێنێ بەسەریهات، دووبارە ژمارە ١٠١ی گوتەوە، مامۆستا بانگیکرد تاوەکو سزای بدات، پاشان ئاگاداری کردەوە سزایەکی قورستری دەدات ئەگەر ئەمجارە هەمان شت دوبارەبکاتەوە، بەڵام نیزال بۆ بەیانی ڕۆژی سێ یەم هەمان کاری دوبارەکردەوە، قوتابیەکان چاوەڕێ بوون ئەمجارە سزایەکی قورستر وەربگرێت، بەڵام مامۆستا لەجیاتی ئەوەی بانگی بکات ئەمجارە خۆی هەڵساو بەرەو ڕووی چوو تا لەگەڵی ڕێکبکەوێت، بەدەنگێکی لەسەرخۆ لێی پرسی:

- نیزال بۆچی سوری لەسەر ئەوەی پێچەوانەی مامۆستاکەت بکەی کە خۆشیدەوێی؟ نازانی کە تۆ باشترین قوتابی منی لەم پۆلە؟ وەکو ئەو قوتابیانەت لێهاتوە کە ڕێز لە کەسانی لەخۆیان گەورەتر ناگرن؟ نازانیت پێویستە ڕێزی مامۆستا بگریت و هەموو

شتێک جێبەجێ بکەی کە داوات لێدەکات؟ مامۆستا هەرگیز هەڵ ناکات، ئەو باشتر بەرژەوەندی تۆ دەزانێت!

- ببورە مامۆستا، مەبەستم بێڕێزی نەبوو، بەڵام من لە دووبارەکردنەوەی هەمان شت بۆماوەی چەند مانگێک بێزاربووم، ئێمە بە دووبارەکردنەوەی هەمان شت لەدوای تۆ هەموو بەیانیەک کات بەفیڕۆدەدەین، بۆیە ویستم شتێکی نوێ فێرببم.

- بەڵام ئەوەی تۆ دەیکەی دەبێتە هۆی دروستبونی پەشێوی لە پۆلەکە، ئەو ژمارەیە زەحمەتترە لەوەی هاوتەمەنەکانت بتوانن وەریبگرن، ئەگەر تەنانەت تۆش بتوانیت وەریبگری بەڵام هاوڕێکانت ناتوانن، بۆیە تۆ دەبیتە هۆی دروستکردنی پەشێوی!

بەپێچەوانەوە مامۆستا، دوێنێ زۆربەی هاوڕێکانم پێیان گوتم: ئەوانیش لە نهێنی دووبارەکردنەوەی هەمان ژمارە هەموو ڕۆژێک تێناگەن، بەڵام ناوێرن لای تۆ باسی بکەن لەترسی ئەوەی سزایان بدەی، بۆیە مامۆستا باشترە ئازادی هەڵبژاردن بە قوتابیەکان بدەی، هەر قوتابیەک ویستی شتێکی تازە فێرببێت فێری بکە، ئەوەیشی کە نایەوێت هەمان شتی بۆ دووبارەبکەوە.

دوای ئەوەی نیزال ئەو قسانەی کرد، مامۆستا تورەبوو جلەکانی گرت و بەتوندی ڕایکێشا و هاواریکرد:

- تۆ ناتوانی ڕێگای کارکردنم بۆ دیاری بکەی منداڵی کەلە ڕەق؟

لەم کاتەدا تەواوی قوتابیەکانی پۆل سەیری نیزال و مامۆستایان دەکرد، مامۆستاش هەستی بەمەکرد، بۆیە خۆی کۆنترۆڵکرد و

دەستی لە جلەکانی نیزال بەردا، پاشان هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی تاوەکو تورەیەکەی بشارێتەوە، پاشان بەدەنگێکی ئارام بە نیزالی وت:

- نیزال شتێک هەیە دەمێکە دەمەوێت پێتی بڵێم، بەڕێوبەر داوای لێکردوم کە چەند قوتابیەک هەڵبژێرم تاوەکو ببنە نوێنەری قوتابخانەکەمان لە فیستیڤاڵی ساڵانەی زانیاری، کە ساڵانە لە نێوان قوتابخانەکانی شارەکامان سازدەدرێت، ئێمە هیچ قوتابیەک لە پۆلی یەکەم هەڵنابژێرین، بەڵام ئەمساڵ من تۆم دیاریکردوە تاوەکو ببیتە بچوکترین قوتابی لە مێژووی قوتابخانەکەمان کە لەم بۆنەیەدا بەژداری کردبێت، بەڵام ئەم کارە وەستاوەتەوە سەر هەڵبژاردنی خۆت، یان گوێ لە قسەکانی مامۆستا دەگریت و دەبیتە قوتابیەکی نمونەیی لەسەر ئاستی شارەکەمان، یان بەردەوام دەبیت لەسەر کەلەڕەقیەکەت و هەموو شتێک لەدەست دەدەیت!

- سوپاس مامۆستا کە منت هەڵبژاردوە، بەڵام هەموو بەیانیەک بەردەوام دەبم لە وتنەوەی ژمارە ١٠١!

لەم کاتەدا مامۆستا سەیری چاوەکانی نیزالی کردو پێی گوت:

- گوێبگرە، هەوڵمدا نەرم بم لەگەڵت، بەڵام وادیارە نەرمبون لەگەڵ تۆ سودی نیە، بە درێژایی چەندین ساڵ هیچ یەک لە قوتابیەکانم هەوڵینەداوە پێچەوانەی من ڕەفتار بکا، ئێستاش ڕێگە نادەم منداڵێکی پیسی وەکو تۆ ئەمە تێکبدات، ئەمە کۆتا ئاگادارکردنەوەمە بۆ تۆ، ئەگەر ئەمە دووبارە بکەیتەوە، بەڵێن دەدەم بتکەمە گاڵتەجاڕی ناو قوتابیەکان، تێگەیشتی؟

دوای ئەوە مامۆستا گەڕایەوە شوێنی خۆی و نیزال بە درێژایی ئەو ڕۆژە بیری لە مەبەستی هەڕەشەکانی مامۆستا دەکردەوە!

***

## نیزال

قوتابیەکـــان بەدوبـــارەکردنەوەی ژمارەکـــان لەدوای مامۆســـتا بەیانیەکەیان دەستپێکرد، بەڵام بە ئاشکرا لەسەر ڕوخساری مامۆستا و قوتابیەکان ئەوە دەبینـرا کە هەمویـان چاوەڕێی ئەوەبـون نیـزال ئەوڕۆژە چـی دەکـات! بەتـایبەت ئەو قوتابیـانەی لە نزیـک نیـزال دانیشـتبون، هەمـوو ئەوەیـان بـۆ قوتابیەکـان گێڕابـویەوە کە ڕۆژی پێشـتر لە نێـوان نیـزال و مامۆسـتا ڕویـدابوو، بۆیە ئەم جـارە دوای تەواوکردنی ژمـارە ١٠٠ قوتابیەکـان پێنەکەنـین و چەپڵەیـان لێنەدا، بەڵکـو هەمویـان بێـدەنگبوون و ڕویـان کـردە نیـزال کە ئەویـش لە شوێنی خۆی هەڵساو بەدەنگێکی بەرز گوتی:

- سەدو یەک!

دوای ئەوە قوتابیەکان ڕویانکردە مامۆستا، تاوەکو بزانن کاردانەوەی چی دەبێت؟!

- قوتابیە ئازیزەکان، هەموتان لە چەند مانگی ڕابردوو تێبینی ئەوەتان کردووە نیزالی هاوڕێتان یادگەیەکی لاوازی هەیە، بۆیە ڕاتان چـی یە ئەگەر نـاوێکی تـازەی بـۆ هەڵبژێـرین، تـاوەکو ئەگەر لە

ڕێگاکاندا ونبوو خەڵکی بیناسنەوە، مامۆستا بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنی و هاواری دەکرد: لەمڕۆ بەدواوە ناوی نیزال بەدەوی دەبێتە (سەدو یەک)!

سەدو یەک، بەبێ ئەوەی هۆکاری ئەم ناونانە بزانن، تەنانەت بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەم قوتابیە کێیە کە شوێنی کەوتوون!

بە تێپەڕبونی ڕۆژگار، نیزال هەستی بە دڵتەنگیەکی زۆر دەکرد لە قوتابخانەکەی و، زیاتر سوکایەتی پێدەکرا، تەنانەت هەندێک لە قوتابیەکان لە مەیدانی قوتابخانە لێیان داو هاواریان دەکرد سەدو یەک، ئەمە وای لێکردبوو زیاتر حەزی لە مانەوە بێت لە پۆلەکەی لە کاتی پشوەکان، سەرەڕای هەموو ئەوانەی توشی بوو، نیزال هەموو بەیانیەک بەردەوام بوو لە دوبارەکردنەوەی ژمارە ١٠١، بەڵام هەموو بەیانیەک ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەنگی نزمتر دەبویەوە لەکاتی دوبارەکردنەوەی ئەم ژمارەیە، ئەمەش وای لە مامۆستا دەکرد کە زیاتر سوکایەتی بە نیزال بکات و داوای لە قوتابیەکان دەکرد سوکایەتی پێبکەن، دوای ئەوە مامۆستا گرنگی بەبونی نیزال نەدەدا لە کاتی وانەکان و نەیدەهێشت وەڵامی هیچ پرسیارێک بداتەوە، سەرەڕای ئەوەی نیزال تاکە قوتابی بوو لە پۆلەکە وەڵامی پرسیارەکانی دەزانی.

پورە خەدیجە هەموو ڕۆژێک نیزالی دەهێنایە قوتابخانەو دەیبردە ماڵەوە، سەرەڕای ئەوەی نیزال هیچ شتێکی بۆ باس نەدەکرد کە لە قوتابخانە توشی دەبوو، بەڵام پورە خەدیجە هەستی بە بێزاری و دڵتەنگیەکەی دەکرد، بەتایبەت کە هەستی بە چەند گۆڕانکاریەک

کردبوو کە وایلێدەکرد هەست بە ترس بکات، کەمتر قسەی دەکرد، دەنگیشی نزمتر دەکردەوە و خواردنەکەشی نەدەخوارد کە بۆی دادەنا، هەروەها لە کاتی هاتنە دەرەوەی لە قوتابخانە دوادەکەوت، چونکە چاوەڕێ بوو هەموو قوتابیەکان بڕۆن بۆ ئەوەی سوکایەتی پێنەکەن لەبەردەم پوری.

- پورە خەدیجە لە ڕێگا لێی پرسی: ڕۆڵە،چی بووە؟
- نیزال بە دەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە: هیچ پورێ... هیچ.

خەدیجە لە ڕۆیشتن وەستاو لەسەر چۆکەکانی هەڵوەستەیەکی کرد و دەستی نیزالی گرت و بە پێکەنینەوە لێی پرسی:

- نیزال پێویست ناکات قسە بکەیت تا لێت تێبگەم، من تەنها بە سەیرکردنی چاوەکانت لێت تێدەگەم، تۆ لەسەرەتای تەمەنت هیچ قسەیەکت نەدەکرد، ئەمەش دایک و باوکتی توشی دڵەڕاوکێ کردبوو، دایکت لە پێش خەوتنت چیرۆکی مێژویی بۆ دەگێڕایتەوە تاوەکو فێرە چۆنیەتی دەربڕینی پیتەکان ببیت، منیش فێرە زمانی جەستە بووم تاوەکو بتوانم بەوە قسەت لەگەڵ بکەم، دوای ئەوەی فێری زمانی جەستە بویت، هەڵسام بە کێشانی چەند هێمایەک تاوەکو تۆ ئەو هێمایە هەڵبژێریت کە دەتەوێت ئامارژەی پێبکەیت بە شتێک، بە تێپەڕبونی کات تەنها بەسەیرکردنی چاوەکانت لێت تێدەگەیشتم، ئێستا تۆ گەورە بویت ڕۆڵەکەم، دەتوانی بەباشی بەبێ ئەوەی قسەیەک بکەیت لێت تێدەگەم، ئێستاش هۆکاری دڵتەنگیتم پێبڵێ لەم ڕۆژانەی دوایی.

- پوریَ تۆ لەسەر حەق بویت لەبارەی هەموو ئەوەی پێت گوتم، لەم دونیایەدا چەندین شت هەن ئەگەر بیانزانین کێشەمان بۆ دروست دەکەن!

خەدیجە زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

- دەمزانی لەدوای ئەوەی پێم وتی تۆ لەگەڕان ناوەستی، رۆڵە ئێستا هەموو شتێکم بۆ باس بکە.

نیزال هەموو شتێکی بە وردی بۆ پوری باسکرد وفرمێسک بە گوناکانیدا دەهاتنە خوارەوە، پاشان پوری لێی پرسی:

- ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟

- ماندوبووم پوریَ، چیتر بەرگە ناگرم، دەبوا لەسەرەتاوە گوێم لە ئامۆژگاریەکانت گرتبا، بەلام تازە کات تێپەڕیوە، پێم وایە کاتی ئەوە هاتوە قوتابخانەکەم بگۆڕم و بچمە قوتابخانەیەک کەس نەمناسێت و لەویَ تەواوی قسەکانی مامۆستاکەم جێبەجێبکەم، تەنانەت ئەگەر باوەڕیشم پێییان نەبێت، بەدوای هیچ شتێکیش نەگەڕێم کە مامۆستام رێگەی فێربونی نەدابێت، قوتابیەکی گوێڕایەڵ دەبم و پێچەوانەی ویستی مامۆستاکەم ناکەم، بەمەش ئەگەڕێمەوە بۆ ئەو ژیانە ئارام و ئاسایشەی قوتابیەکانی تر هەیانە.

خەدیجە بە ئارامی گوێی لە نیزال گرتبوو کاتێک قسەکانی تەواوکرد، چەند چرکەیەک بێدەنگ بوو پاشان وتی:

- نیزال ئایە دەزانی کە من ناوم ناویت؟

- نیزال فرمێسکەکانی سڕی و بە زەردەخەنەوە وەلامی پوری دایەوە: بەلێ پوریَ ئەوە دەزانم، دەیان جار ئەوەت پێگوتوم.

- راسته، بەڵام پێشتر پێم نەگوتوی کە بۆچی ئەو ناوەم لێناوی، کاتێک لە سکی دایکت دابویت، دایک و باوکت نەیاندەویست بزانن کە منداڵەکەیان کچە یاخود کوڕ، چەند مانگێک دەگەڕان بەدوای ناوێکی گونجاو بۆ منداڵەکەیان، دەیانویست ناوەکە بە جۆرێک بێت کە لە خێزانەکەمان پێشتر کەس بەو ناوە ناو نەنرابێت، من پێشنیاری ناوی نیزالم بۆکردن، ئەوانیش لەبەر ئاسانی دەربڕینی و جوانیەکەی ئەم ناوەیان بەدڵبوو، بەتایبەت کە ئەم ناوە بۆ هەردوو ڕەگەزەکە دەگونجا، بۆیە ئەم ناوە دەگونجا بۆ منداڵەکە ڕەگەزەکەی هەرچیەک بوایە، بەڵام بۆ دایک و باوکتم باسنەکرد کە من ئەو ناوەم هەڵبژاردوە تاوەکو (نیزال واتە تێکۆشان) بە درێژایی ژیانت لەگەڵت بێت و ئەم وشەیە بە ڕێگای ژیانتەوە گرێدراوبێت، تاوەکو وەکو من و زۆرێک لە خەڵکی تر نەبیت کە لە تەمەنێکی زوو واتای تێکۆشان نازانن و لە ژیان زۆر توشی چەرمەسەری دەبن و دەستبەرداری زۆربەی شتە جوانەکانیان دەبن، تاوەکو لەکۆتایدا واتای ئەو وشەیە دەدۆزنەوە بۆ تەواوکردنی ڕێگای ژیانیان.

- ڕێگای ژیان؟! پورێ مەبەستت چی یە لە ڕێگای ژیان؟

پێش ئەوەی قسەکانی دەست پێبکات خەدیجە زیاتر لە نیزال نزیک کەوتەوە:

- ڕۆڵە، باش گوێم لێبگرە، ژیان بەو شێوەیە نابێت کە لە منداڵیمان خەونی پێوەدەبینین، ژیان ئەو باخچە ڕازاوەیە نیە پڕە لە گوڵ و گوڵزارو ئاسمانێکی ڕوون، خەڵکیش لەم ژیانەدا وەکو ئەو منداڵە پاکانە نین کە لە منداڵیدا دەماننناسین، ژیان زۆر لەوە

قورستر و ئاڵۆزتره، ژیان ڕێگایەکی درێژ و سەختە تیایدا ڕووبەڕووی زریانێکی سەخت دەبیتەوه، هەرچەند زیاتر بەرەو پێشەوه بچیت، ئاسمانەکەشی هەورێکی ڕەش دایدەگرێت و لە ڕوناکی ڕۆژ بێبەشت دەکات، تاوەکو زیاتر بەرەو پێشەوه بچیت لەدەورتدا دڕندەی ڕاوکەری زیاتر دەبینی، کە هیچ واتایەکی سۆزو بەزەیی نازانن و دەیانەوێت بەهەر جۆرێک بێ بەرەوپێش چونەکەت بوەستێنن و بتشکێنن، گەر بتوانن پارچە پارچەت بکەن، هەرچەندە بەهێزبیت و سوربیت ناتوانی بەرەو پێشەوه بچیت بەبێ ئەوەی پێکانت بخلیسکێن و چەندین جار بکەویت و هەستیتەوه، لەم ڕێگایەدا خەڵکی دەبنە سێ بەش، بەشی یەکەمیان: دوای یەکەم کەوتن خۆیان بەدەستەوه دەدەن، جۆری دووەمیان: دەیانەوێت بەرگری بکەن، بەڵام دواتر خۆیان بەدەستەوه دەدەن، دوای ئەوەی هیوا لەدەست دەدەن کە وزەی ڕێگاکەیانە و بە بەهانەی سەختی ڕێگاو ترس لە دڕندەکانی، بەڵام جۆری سێیەمیان: ئەمانە مرۆڤە شەڕکەرەکانن، ئەمانە مرۆڤە مەزنەکانن، تەنها ئەمانە دەتوانن تا کۆتایی ڕێگاکە بڕۆن، ئەمان هەرگیز خۆیان بەدەستەوه نادەن، چونکە واتای خۆبەدەستەوەدان نازانن، سەرەڕای سەختی ڕێگاو ئازارەکانی لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبن، مەرج نیە ئەمانە بەهێزترین یاخود زیرەکترین بن، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەیە، ئەمانە باوەڕیان بەخۆیان هەیە، باوەڕیان بەوە هەیە خودا بێ هۆکار دروستی نەکردون و بونیان واتایەکی هەیە، ئەمانە دوای هەر کەوتنێک بە سوربونێکی زیاتر هەڵدەستنەوه تاوەکو ڕێگاکەیان تەواوبکەن،

گرنگی بە سەختی و بەربەستەکانی ڕێگە نادەن، دوای ئەوەی ئەو جۆرە جیاوازەی مرۆڤ تاکە بژاردەیان هەڵدەبژێرن، بەردەوامی، بەردەوامــــــــــی لە ڕێگـــــــــای ژیـــــــــان!

-پوریێ مەبەستت ئەوەیە لە قوتابخانەکەم بمێنمەوە و لەجیاتی ئەوەی بچمە قوتابخانەیەکی تر ڕوبەڕوی سەختیەکان ببمەوە؟

- نیزال من ناتوانم ئەوە بۆ تۆ دیاری بکەم، تەنیا خۆتی دەتوانی ئەوە دیاری بکەیت، تەنیا تۆی مافی هەڵبژاردن و دیاریکردنی ژیانی خۆتت هەیە، من و کەسانی دیکە تەنیا دەتوانین ئامۆژگاریت بکەین، بەڵام هەڵبژاردنی ڕووگەی ژیانت ئەوە مافی خۆتە!

- نیزال بەدودڵیەوە پرسی: پوریێ چ ئامۆژگاریەکم دەکەی؟

- نیزال من لەوکەسانە نیم حەز لە ڕوبەڕوبونەوە دەکەن لە ژیان، بۆیە لەسەرەتاوە پێم وتی واز لەو ژمارەیە بێنی، توشی بارگرانیت دەکات، بەڵام تۆ لەمن ئازاتر بویت، تەنیا بە دوبارەکردنەوەی ژمارە ١٠١ هەموو بەیانیەک شکستی مامۆستا و دەزگا پەروەردەییەکەت ڕادەگەیاند و ڕاتدەگەیاند کە هێشتا قوتابی جیاوازی وا هەن کە نایانەوێت ببنە توتی و هەرچیەک گوێیان لێ بوو بیڵێنەوە، بۆیە مامۆستاکەت بەهەرشێوەیەک بێت دەیەویست لە وتنەوەی ئەم ژمارەیە بتوەستێنێت، بۆیە هەموو ڕێگاکانی هەڕەشە و لێدان و فەرامۆشکردن و ڕێککەوتن و لە کۆتایشدا سوکایەتی تاقیکردەوە لە دژت، بەڵام تا ئێستا ملت نەداوە و لە مامۆستا و زۆرداریەکەی بەهێزتر بویت، تۆ دەستت بەم جەنگە نەکردوە، بەڵام

هەتا جەنگ بەسەرتدا سەپابێت، جگە لەسەرکەوتن بە چیتر ڕازی نەبیت!

دوای ئەو ئامۆژگاریانە پورە خەدیجە دەستی برازاکەی بەتوندی گوشی و نیزال هەستی بە دڵنیاییکرد، پاشان بەبێ دەنگی ڕێگاکەیان بەرەو ماڵەوە تەواوکرد، نیزال بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بیری لە قسەکانی پوری دەکردەوە، تاوەکو بڕیار بدات بەیانی ڕۆژی دواتر چیبکات!.

***

## ١٠١

قوتابی ژمارە ١٠١ ئەو نازناوە بوو نضال بەدەوی پێ جیادەکرایەوە لە نێو هەموو قوتابیەکانی قوتابخانەی هیوای سەرەتایی، دوای ئەوەی چیرۆکەکەی لە نێویان بڵاوبویەوە، قوتابیەکان هەواڵی ئەو قوتابیە بچوکەیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە کە بە تەنیا توانیویەتی شێوازی ئەو وانەوتنەوە کۆنە بگۆڕێت، کە مامۆستای بیرکاری بۆماوەی دەیان ساڵ پەیڕەوی دەکرد، دوای ئەوەی مامۆستا ستەمکارەکەی بیرکاری پێیوابوو خەریکە خۆی بەدەستەوە دەدات و ڕادەست دەبێت، مامۆستاکەی بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو تێبینیکرد کە نیزال هەموو بەیانیەک بە دەنگێکی بەرزتر لە ڕۆژانی پێشوتر ژمارە ١٠١ دوبارەدەکاتەوە، هەروەها وای لێهاتوە گرنگی بەوە نادات کە قوتابیەکان بە ١٠١ بانگی دەکەن، بەڵکو بە

پێچەوانەوە پێی خۆشحاڵەو شانازی پێوەدەکات، تەنانەت داوای ل
پوری کردبوو کە ژمارە ١٠١ بە ڕەنگێکی زێڕین لەسەر پشتی جل
وەرزشیەکەی بکێشێت کە لەکاتی یاریکردن دەیپۆشی، لە جیاتی
ئەوەی ئەو ژمارەیە ببێتە هۆی شەرمەزاری بۆ نیزال، ئەو ژمارەیە
بوو بووە هێمایەک بۆ زۆر واتای مرۆڤایەتی کە زۆربەی قوتابیەکان
ونیان کردبوو، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی قوتابیەکان دەترسان
هاوسۆزی و پاڵپشتی بۆ کارەکەی نیزال دەرببڕن، بەڵام مامۆستا
زۆردارەکە هەستی کرد نیزال بۆتە هۆی مەترسیەکی ڕاستەقینە
لەسەر شێوازە کۆنەکەی وانە وتنەوەی، هەروەها خاوەنی ژمارە ١٠١
بویە ئیلهام بەخشی زۆرێک لە قوتابیەکان کە پرسیاری وایان دەکرد
پێشوتر شتی وایان لێ نەبیسترابوو، بۆیە مامۆستا بڕیاریدا خۆی لە
نیزال ڕزگار بکات، بە دانانی پلانێک کە ببێتە هۆی دەرکردنی لە
قوتابخانە، یان بەلانی کەم گواستنەوەی بۆ قوتابخانەیەکی تر،
مامۆستا بە یەکێک لە قوتابیەکانی گوت نمرەی تەواوی پێدەدات
بەرانبەر ئەوەی تەواوی پەرتوکەکانی بیرکاری بدڕێنێت جگە لە
پەرتوکەکەی نیزال، ئەمەش لە کاتی چۆڵبونی پۆلەکە لە قوتابیان
لە کاتی پشوو، پاشان ئەو قوتابیە وا بڵاوبکاتەوە کە نیزال بەدەوی
ئەم کارەی کردوە، وەکو تۆڵە کردنەوەیەک لە قوتابیەکان، بەرانبەر
سوکایەتی پێکردنی و بانگکردنی بە ١٠١، ئەم پلانە جێبەجێ کراو
دواتر ڕاستەوخۆ نیزال بە دڕاندنی پەرتوکی هاوڕێکانی تاوانبارکرا،
بەڵام بەڕێوبەری قوتابخانە بە زویی ئەم پلانەی ئاشکراکرد، دوای
ئەو چەند دایک و باوکێک بۆ بەڕێوبەریان گێڕایەوە کە پێشتر

ماموستاکەیان داوای جێبەجێکردنی ئەم پلانەی لە منداڵەکانیان کردوە، بەڵام دوای ئەوەی منداڵەکانیان ڕەتیان کردۆتەوە ماموستا بە سزای توند هەڕەشەی لێکردون ئەگەر بۆ کەسێک باسی بکەن، دوای لێکۆڵینەوەیەکی کورت لەگەڵ نیزال و هاوڕێکانی، ئەو قوتابیەی ئەم کارەی کردبوو دانی بەکارەکەی داناو بە بەڕێوبەریشی گوت ماموستا داوای لێکردوە ئەم کارە بکات، هەروەها بەڕێوبەر باسی نیزال و ماموستا و ژمارە ١٠١ ی زانی، کۆپیەک لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی نارد بۆ وەزارەتی پەروەردە و، وەزارەت بڕیاریدا بە دەرکردنی ئەم ماموستایە لە پلەکەی بۆ هەتا هەتایە و ناردنی بۆ لێکۆڵینەوە، پاشان بڕیارێکی گشتی دەرکرد بۆ تەواوی قوتابخانە سەرەتایەکانی وڵات بە لابردنی دیاریکردنی چەند ژمارەیەک بۆ فێربون بۆ هەر پۆلێکی سەرەتایی، هەروەها وەزارەت بڕوانامەیەکی سوپاس و پێزانینی بۆ نیزال بەدەوی نارد کە لەلایەن خودی وەزیرەوە واژوو کرابوو، بەمەش نیزال بوە بچوکترین قوتابی وڵات کە ئەم ڕێزلێنانە لە وەزارەتەوە وەربگرێت.

سەرەڕای ئەوەی بەهۆی هەڵنەبژاردنی لەلایەن ماموستا ستەمکارەکەی نەیتوانی بەشداری ڤیستیڤاڵی قوتابخانەکان بکات، لە پۆلی دووەمەوە نیزال بووە کاپتنی ئەو گروپەی قوتابخانەکەی کە بەشداری ئەم ڤیستیڤاڵەی دەکرد، پورە خەدیجەی هەموو ساڵێک بۆ ئەم بۆنەیە ئامادەی دەکرد و چەندان گۆڤار و پەرتوکی بۆ دەهێنا کە زانیاری جۆراوجۆری لەخۆ دەگرت لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست، لەبەرئەوەی پورە خەدیجەی بەو نەخۆشیەی نیزالی دەزانی

که دەبووە هۆی ئەوەی لەبەرکردنی شتەکان بۆی کارێکی سەخت بێت، بۆیە ڕێگایەکی داهێنەرانەی لە فێرکردنی نیزال گرتەبەر، بە گەیاندنی زانیاریەکان لە کەشێکی پڕ لە تام و چێژ، لەڕێی بەکارهێنانی ئەم ڕێگایەوە پورە خەدیجە زانیاریەکانی دەگەیاندە مێشکی نیزال بەبێ ئەوەی هەست بە ماندوبون و بێزاری بکات، پورە خەدیجە ئەو زانیاریانەی دەکردە کۆمەڵێک مەتەڵی جۆراوجۆر، هەر مەتەڵێک کۆمەڵێک هێمای نهێنی لەخۆی دەگرت، دەبوایە نیزال بیزانیایە تا لەکۆتایدا دەگەیشتە زانیاریە دروستەکە، بۆ زیاتر دروستکردنی جۆش و خرۆش بۆ ئەو مەتەڵانە، پورە خەدیجە ئەو هێمایانەی لەسەر پەڕی شێوە نەخشە دەکێشا، بۆ تێگەیشتن لەو هێمایانەش دەبوایە نیزال زانیاری زۆری بخوێندبایەوە کە وەڵامی ئەو نهێنیانەی تێدابوو، هەر هێمایەک دەیگەیاندە شتێکی دیاریکراو کە خەدیجە لە شوێنێکی ماڵەکە شاردبویەوە، دوای گەیشتنی بەم شتە نیزال زانیاری تازەی بۆ ئاشکرا دەبوو کە دەیگەیاندە هێڵی دواتری نهێنیەکە، بەم شێوەیە هێڵ لەدوای هێڵ تا لە کۆتایدا دەگەیشتە دۆزینەوەی نهێنیەکە، لەمیانەی قۆناغەکانی دۆزینەوەی نهێنیەکە، هەر زانیاریەک کە نیزال دەیخوێندەوە لە مێشکی دەچەسپا، بە وێنەو هێما و شێوە، ئەم چالاکیانەش بوو بووە هۆی ئەوەی نیزال زانیاری زۆری پێبێت و لە دۆزینەوەی ئەو مەتەڵە ئاڵۆزانە توانایەکی عەقڵی زۆری هەبێت.

نیزال و عبدالعزیزی هاورێی خەریکی قسەکردن بوون لەوکاتەی لە شەقامی خیرالدین بەربەڕۆسا کە دەکەوێتە ناوچەی بێشکتاش لە ئیستەنبۆڵ دەڕۆیشتن.

- دەزانی نیزال لەو کاتەی لە فڕۆکە لە تەنیشتت دانیشتم زانیم من شێتم؟ ئەگینا چۆن ڕازی بووم دوای یەک ڕۆژ لە گەیشتنەوەم لەندەن جێبهێڵم ؟!

نیزال پێکەنی و گوتی:

- هاوڕێی شیرینم، بەڵام ئەوە بۆ من زۆر کۆنە، من لەمێژە دەزانم کە تۆ شێتی، لەوکاتەی بۆ یەکەم جار لە زانکۆی ئۆکسفۆرد تۆم بینی، ئەو ڕۆژەت لەبیرە؟

عبدالعزیز وەڵامی دایەوە:

- مەبەستت ئەو کاتەیە لە باخچەی زانکۆ خۆت لێم دا و ڕۆمانە خۆشەکەمم لێ کەوتە ناو قوڕاو؟

- یەکەم، تۆ خۆت لەمن دا لەو کاتەی خەریکی پەیوەندیکردن بووم، دووەم، سەرەڕای داوای لێبوردن، ڕۆمانەکەشتم لەسەر زەوی هەڵگرتەوە، سێیەم، پێشنیاریشم بۆکردی پارەکەی بدەم، بەڵام تۆ هاوارت کرد و بەوە تاوانبارت کردم ئەم کارەم بە ئەنقەست کردووە، چونکە کەسێکی ڕەگەزپەرستم، ئەو کاتە هەستمکرد بەرامبەر یەکێک لە شێتەکانی دونیام، ڕەنگمان زۆر جیاوازی نەبوو، بەڵام تۆ ئەو کاتانە قژە درێژەکەت لەسەر شێوەی جامایکی دەبەست، بۆیە پێم

وابوو خەڵکی یەکێک لە وڵاتانی کاریبی بیت، بۆیە بە زمانی عەرەبی قسەم لەگەڵ نەکردی، تاوەکو تۆ بە وشەیەکی مەغریبی قسان پێگوتم لەگەڵ بیستنی زانیم تۆ خەڵکی یەکێک لە وڵاتانی باکوری ئەفریقیایی، هەرچەندە تا ئێستا نازانم واتای ئەو وشەیە چییە!

- پێویست ناکات واتای ئەو وشەیە بزانی نیزال، گرنگ ئەوەیە تۆم بەخشی و لەو ڕۆژەوە بووینەتە هاورێ.

دوای نزیکەی نیو کاتژمێر ڕۆیشتن لە ناکاو نیزال وەستا و سەیری هاورێکەی کرد و گوتی:

- عبدالعزیز، لە مۆزەخانەکە نزیک بووینەتەوە، ئەو پلانە تێگەیشتی کە دوێنی لەسەری ڕێککەوتین.

- دوودڵ مەبە نیزال، بەتەواوی تێگەیشتووم، هەریەکەمان لە کاتێکی جیاواز دەچینە ناو مۆزەخانەکە تاوەکو ئەگەر یەکێکیشمان ئاشکرابوو ئەوی ترمان نەدۆزنەوە، سەرەتا تۆ دەچیتە ژورەوە، دوای چارەگێک من دێمە ژوورەوە، لەبەرئەوەی ڕێگە بە بردنە ژورەوەی مۆبایل و کامێرا نادەن، بۆیە لە شوێنی تایبەتی خۆی لە پێش دەرگا دایان دەنێین، دواتر لە مۆزەخانەی تایبەت بە مێژووی دەریایی عوسمانی دەچینە بینای دووەم، لەوێ دەچمە لای دەستشۆرەکە و هەندێک جلی سپی لێیە کە کرێکارەکانی پاکردنەوە لە کاتی کارکردنیان دەیپۆشن، یەکێک لەو جلانە دەپۆشم و دواتر بەرەو هۆڵی بەربەڕۆسا دەڕۆم.

- دوای دەرچوونت لە دەستشۆرەکە من لە هۆڵی سەرەکی دەبینی کە خەریکم لەگەڵ پاسەوانەکە قسەدەکەم، تاوەکو دەم و

چاوت نەبینێت لەکاتی چونە ژوورەوە بۆ هۆڵی تایبەت بە کەلوپەلەکانی بەربەرۆسا.

- نیزال تۆ دڵنیای دەرگای هۆڵەکە کراوەتەوە؟

- هۆڵەکە لە بنەڕەتدا هەر دەرگای نییە، بەڵکو ڕێڕەوێکی بچوکی هەیە بە هەیوانی بینایەیی دووەم دەیبەستێتەوە، لە کاتی ئاسایی هەموو کات ئەو ڕێڕەوە کراوەیە، بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆژانە خەریکی چاکردنن بەتایبەتی لەو هۆڵە، بۆیە ئەم ڕێڕەوەیان بە پەردەیەک گرتوە، دەتوانی لە لاکانی ئەم پەردەیە بە ئاسانی بچیتە ژوورەوە، دوێنێ کە هاتم بۆ هۆڵی بەربەرۆسا بۆ گەڕان بەدوای هێڵەکانی نهێنییەکەمان زانیم ئەم هۆڵە بۆ چاککردنەوە داخراوە، دوای ئەوەی پرسیم کەی بۆ سەردانکەرانی دەکرێتەوە؟ پێیان گوتم: کارەکە چەند مانگێک دەخایەنێت، هاوڕێ ئێمەش ناتوانین چەند مانگێک بۆ دۆزینەوەی نهێنی بەربەرۆسا چاوەڕێبین، من دوێنێ بە تەواوی لەم مۆزەخانەیە مامەوە تا توانیم ئەم پلانە دابنێم بۆ ئەوەی بزانین ئەو هۆڵە چی لەخۆگرتوە.

- بەڵام دڵنیایی ئەم هۆڵە کەسی تێدا نییە کاتێک کە من دەچمە ژوورەوە؟

- دوێنێ کاتێک قسەم لەگەڵ کارمەندی پێشوازی دەکرد، سەرسوڕمانی خۆم ڕاگەیاند بۆچی کارەکانی چاککردنەوە هێندە دەخایەنێت؟ پێی گوتم: هۆکارەکەی ئەوەیە، زۆربەی کارمەندەکان لە پشوی هاوینەن، بۆیە کارەکانی چاککردنەوە تاوەکو کۆتایی هاوین وەستاون.

- ئەی کامێراکانی چاودێری هۆڵەکە؟
- کامێراکانی چاودێری هیچ شتێکی نائاسایی نابینن، تۆ وەکو کارمەندێکی پاککردنەوە دەچیتە ژوورەوە، بەتایبەت تۆ دەست لە هیچ شتێک نادەی و هیچ کارێک ناکەی ببێتە جێی گومان، دوێنێ کارمەندێکی پاککردنەوەم بینی چووە ژوورەوە و دوای چارەگێک هاتە دەرەوە، بۆیە هەوڵبدە بەهەرجۆرێک بێت کارەکەت لە چارەگێک زیاتر نەخایەنێت، تەنانەت ئەگەر هیچ داوێکی نهێنییەکەشمانت نەدۆزیەوە، سەلامەتیت لە پێش هەموو شتێکە، تێگەیشتی عبدالعزیز؟
- ئاشکرایە نیزال، هەرکە چوومە ژوورەوە، ئاگاداری کاتژمێرەکەم دەبم.
- هەوڵدە لە هۆڵەکە هەر شتێک بدۆزیەوە کە پەیوەندی بە داوی دووەمی نهێنیەکەمانەوە بێت، ئەویش ژمارە (١٠٢)ە، ئەگەری زۆرە ئەو ژمارەیە تایبەت بێت بە یەکێک لە کەلوپەلەکانی بەربەرۆسا یان یەکێک لە وێنەکانی، تکایە هەرشتێک تێبینیت لەسەرە لەبەری بکە، تەنانەت ئەگەر ئەو تێبینیانەش بۆ تۆ گرنگ نەبن.
- خەمت نەبێ هاورێ، دەتوانی پشت بەمن ببەستی، من یادگەیەکی بەهێزم هەیە.
- ببورە عبدالعزیز، دەمویست ئەم کارە بەتەنیا بکەم، بەڵام تۆ دەزانی کە یادگەم پشتی پێ نابەسترێت، ئەگەر ترسم لەوە نەبوایە کە کامێراکانی چاودێری ڕەچاوم بکەن لە کاتی بەکارهێنانی

پێنوس و تێنووس بۆ نوسینەوەی تێبینیەکانم لە هۆڵەکە، من بە کاری پاککەرەوەکە هەڵدەستام.

- نیزال تۆ تەنها پاسەوانەکە سەرقاڵ بکە، منیش یەکێک لە ماسیحەکان هەڵدەگرم و دەڕۆمە هۆڵی بەربەرۆسا، هۆڵەکە بەوە دەناسمەوە ئاڵای بەربەڕۆسای لەسەرە وەکو پێت گوتم، بەڵام نیزال پێم بڵێ: ئەگەر کارەکەمان ئاشکرابوو چی ڕوودەدات؟

- عبدالعزیز لەبیرت نەچێت ئێمە هیچ کارێکی نایاسایی ناکەین، ئێمە هیچ شتێک نادزین و وێنەی هیچ شتێکیش ناگرین، هەروەها هیچ شتێک لەسەر پەڕ نانوسینەوە، تەنانەت ئەگەر کارەکەشمان ئاشکرابێت، لەلایەنی یاساییەوە ئێمە هیچ تاوانێکمان نەکردووە و بەگشتی کارمەندەکانی مۆزەخانە لەگەڵ هەندێک سەردانکەری شێتی مێژوو ڕاهاتوون، ئەو کەسانە لەکاتی سەردانکردنی مۆزەخانەو شوێنە مێژووییەکان یاساکان دەشکێنن و حەزدەکەن هەموو شتێک ببینن تەنانەت شتە قەدەغەکراوەکانیش، ئەگەر پرسیاریشیان لێکردی: بۆچی جلی کارمەندی پاککردنەوەت پۆشیوە؟ پێیان بڵێ: ئەم جلانەت تەنیا بۆ ئەوە پۆشیوە بتوانیت بچیتە ژوورەوە و شتەکانی ناوی ببینی ئەم جلانەت پۆشیوە، بەتایبەت کە وەکو ئاشکرایە لە پاسپۆرتەکەت تۆ گەشتت بۆ ئیستەنبوڵ تەنیا لەو پێناوە کردووە، لە خراپترین دۆخدا دوای پشکنین و دڵنیابوونەوە لە کارەکەت لە مۆزەخانەکە دەردەکرێی.

دوای ئەم گفتوگۆیەی نێوان نیزال و عبدالعزیز، هەردوو هاوڕێکە گەیشتنە مەیدانی گەورەی بەربەڕۆسا، سەرەتا سەردانی سەرکردەی

دەریایی ئیسلامی خیرالدین بەربەڕۆسایان کرد، کە دەڕوانێتە سەر دەریا، عبدالعزیز گوێی لەدەنگی تۆپ هاوێژەکان بوو سات نا ساتێک لەو کەشتیانەوە دەڕۆیشتن لە دەریا.

- ئەو دەنگە چییە نیزال؟ هۆکاری ئەم دەنگانە چییە سات نا ساتێک؟!

- ئەوە دەنگی سڵاوی سەربازییە کە تۆپ هاوێژەکانی کەشتیگەلی جەنگی تورکی دەیتەقێنن، ئەمە لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە خوێکی بەردەوامە، هەر کەشتییەکی جەنگی عوسمانی بۆ کارێکی جەنگی یاخود ڕاهێنان یان گەشت بڕۆن، لە کاتی تێپەڕبوونیان بەلای گۆڕی خیرالدین بەربەڕۆسا تۆپێک دەهاوێژن بۆناو دەریا، تا ئێستاش کەشتیگەلی جەنگی تورکی لەسەر هەمان کردار بەردەوامن.

عبدالعزیز بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- تا ئێستا بەم ڕادەیە تورکەکان ڕێزی مێژووی بەربەڕۆسا دەگرن؟

- زیاتر لەوەش عبدالعزیز، چونکە ئەم سەرکردە دەریاییە سەرکردەیەکی ئەفسانەیی بووە، بەشێوەیەک گەورەترین سوڵتانی عوسمانییەکان، سوڵتان سولەیمانی قانونی سوربوو لەسەر ئەوەی خۆی لە ئیستەنبۆڵ لە کاتی گەڕانەوەی کەشتیگەلەکەی لە یەکێک لە جەنگەکان بە درێژایی دەریای سپی ناوەڕاست پێشوازی لێبکات، ئەوەش بزانە سرودی فەرمی هێزی دەریایی تورکی تا ئێستا ناوی (سرودی بەربەڕۆسا)یە.

دوای سەردانکردنی گۆڕی بەریەرۆسا و نزاکردن بۆی ، نیزال لە نزیک گۆڕەکە بەرەو مۆزەخانەی دەریایی چوو، دوای ئەوە بە چارەکێک عبدالعزیز بەرەو دەستشۆرکەی بینای دووەمی مۆزەخانەکە چوو، لەکاتێکدا نیزال خەریکبوو پاسەوانەکە سەرقاڵبکات، بەڵام بێ سوودبوو، چونکە پاسەوانەکە وەڵامێکی کورتی دەدایەوە، کاتێک نیزال بە زمانی ئینگلیزی دەربارەی شتەکانی ناو مۆزەخانەکە پرسیاری لێدەکرد، هەموو هەوڵەکان بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ پاسەوانەکە شکستی هێنا، بە شێوەیەک نیزال ویستی هەر لەسەرەتاوە پرۆسەکە ڕابگرێت، بەڵام بڕیاریدا کۆتا هەوڵی خۆی بدات، ئەمجارە بڕیاریدا دەربارەی مۆزەخانەکە پرسیاری لێنەکات، بەڵکو پرسیار لە شتێک بکات کە تورکەکان زۆریان حەز لێیە، دەربارەی تۆپی پێ.

- تۆ هاندەری یانەی بێشکتاشی یاخود یانەی فەنەرباخچە؟

هەرکە نیزال ئەم پرسیارەی کرد، یەکسەر پاسەوانەکە کەوتە قسەکردن:

- بەدڵنیاییەوە بێشکتاش، فەنەرباخچە تیپێکی لاوازە، بێشکتاش هەزار جار لەو بەهێزترە.

- بەڵام هەفتەی ڕابردوو فەنەرباخچە بە دوو گۆڵی خاوێن لێیبردنەوە.

هەرکە نیزال ئەم قسەیەی کرد پاسەوانەکە کەوتە باسی ستەمکردنی دادوەری یارییەکە لێیان، هەروەها کەوتە باسی لێکدانەوەکانی بۆ یارییەکە، بەڕای ئەو یانەکەی ستەمێکی بە ئەنقەستی لەلایەن

دادوەرەوە لێکراوە، دوای ئەوە باسی مێژووی یارییەکانی بێشکتاشی بەرانبەر فەنەرباخچە کرد، لە کاتێکدا نیزال بەبێ دەنگی گوێی لە پاسەوانەکە گرتبوو، بینی عبدالعزیز بە جلی پاککەرەوەکان چووە ناو هۆڵە سەرەکییەکە و ماسیحەیەکیشی هەڵگرتبوو، نیزال سەیری کاتژمێرە گەورەکەی کرد، کە لەسەر دیوارەکە هەڵواسرابوو، بۆ ئەوەی چارەگێک بژمێرێت بۆ تەواوبونی پرۆسەکە، لەکاتێکدا وای نیشاندەدا بە بێدەنگی گوێی لە پاسەوانەکە گرتوە، دوایی نزیکەی ١٤ خولەک لە چوونە ژوورەوەی عبدالعزیز، لەناکاو پاسەوانەکە لە قسەکردن وەستاو لە نیزال دوورکەوتەوە و بەرەو ڕێڕەوی هۆڵی بەربەڕۆسا ڕۆیی، لەم کاتەدا لێدانی دڵی نیزال زیادی کردو ترسێکی زۆری بەدڵدا هات، چونکە دوای نزیکەی یەک خولەکی تر عبدالعزیز لە هۆڵەکە دەهاتە دەرەوە و بە دڵنیایەوە پاسەوانەکە دەیبینێت و هەموو شتێک ئاشکرا دەبێت، سەرەڕای ئەو پاڵەپەستۆ زۆرەی لەسەری بوو، نیزال توانی خۆی کۆنترۆڵ بکات و لە پاسەوانەکەی پرسی کە لێی دوردەکەوتەوە:

- بۆ زانیاریت من لە هاندەرانی یانەی گەلەتەسەرای تورکیم!

هەرکە نیزال ئەم قسەیەی کرد، پاسەوانەکە بەرەو لای ئەو سوڕایەوەو بە تورەیەوە بەرەو لای هات و دەستی بە گێڕانەوەی ئەوە کرد چۆن بێشکتاش بە درێژایی مێژوو سەرکەوتوو بوە بەسەر گەلەتەسەرای، هەروەها گەلەتەسەرای و فەنەرباخچە یانەی چینی دەوڵەمەندی شاری ئیستەنبۆڵن، لە کاتێکدا بێشکتاش یانەی زۆرینەی خەڵکی ئیستەنبۆڵە بە هەژار و کرێکارەکانەوە، دوای ئەوە

پاسـەوانەکە باسـی مێـژووی یارییەکـانی نێـوان بێشـکتاش و فەنەرباخچەی کرد، لەو ساتەدا نیـزال هەناسـەیەکی ئارامی هەڵمژی کە بینـی عبـدالعزیز لە هـۆڵی بەربەڕۆسا هـاتە دەرەوەو ڕاستەوخۆ بەرەو دەستشـۆرگەکە ڕۆیـی، لە ناکـاو پاسـەوانەکە لە قسـەکردن وەسـتا، دوای ئەوەی لە لایەن هـاوڕێیەکیەوە بە بێـتەل پەیوەنـدی پێوەکرا و پاسەوانەکە بەبێدەنگی گوێی لێگرتبوو، نیـزال سـەرقاڵی پاسـەوانەکەی قۆسـتەوەو بەرەو دەرەوەی مۆزەخـانەکە بەڕێـکەوت، تـاوەکو لەو شـوێنە لەگەڵ عبـدالعزیز یەکتـری ببیـنن کە لەسـەری ڕێکەوتبون پێشتر.

پاسەوانەکە ڕووی لە نیزال کردو پێی وت:

- بوەستە!!

نیزال ڕووی کردە پاسەوانەکەو قاچەکانی لە شوێنی خۆی وشکبوون، چونکە هەستیکرد کارەکەیـان ئاشـکرابووە، پاسـەوانەکە بەهێواشـی بەرەو نیزال هات و دەستی خستە سـەر شـانی، پاشـان پاسـەوانەکە دوگمەکـانی کراسـەکەی کـردەوە و لە ژێـرەوە تیشـێرتێکی وەرزشـی پیشاندا کە لە هەردوو ڕەنگی ڕەش و سپی پێکهاتبوو، ئەم تێشێرتە جلی فەرمی یانەی تۆپی پێی بێشکتاشی تورکی بوو.

- گـوێ بگـرە، ئـێمە لێـرە لە بێشـکتاش ڕسـتەیەکمان هەیە هەمیشە دووبارەی دەکەینەوە: ((پیاوی ڕاستەقینە نابێتە هاندەری یانەیەکی ڕەنگا و ڕەنگ!)).




نیـزال به زەردەخەنەوە گـوێی لە پاسـەوانەکە گرتبـوو، تێگەیشت پاسـەوانەکە مەبەسـتی گـاڵتەکردنە بە جلـی ڕەنگـاوڕەنگی هەردوو یانەی گەلەتەسەرای و فەنەرباخچە، بە پێکەنینەوە بە پاسـەوانەکەی گوت:

- هاوڕێ دڵنیابە مـن دوای ئەم دیدارەم لەگەڵ تـۆ، جگە لە یـانەی بێشـکتاش نـابمە هانـدەری هـیچ یـانەیەکی تـری تـورکی!

پاشـان نیزال و پاسـەوانەکە ماڵئاوایـان لە یەکتـری کـردو نیـزال بە خێرایی بەرەو لای عبدالعزیز چـوو تـاوەکو بە وردی ئەوەی بـۆ باس بکات کە لە هۆڵی بەربەڕۆسا بینیویەتی.

❊❊❊

## بەربەرۆسا فەرەنسا ڕزگار دەکات

نیزال و عبدالعزیز لە ناو میترۆکە لە پاڵ یەکتری دانیشتبوون کە بەرەو ناوچەی (فاتیح) دەڕۆیی، کە ئەو هۆتێلەی لێی دەمانەوە دەکەوتە ئەوێ، بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی پێشتر لەسەری ڕێکەوتبوون نەدەبوایە لەگەڵ یەکتری بدوابان، تا دەگەیشتنەوە هۆتێلەکەیان، بەڵام نیزال نەیدەتوانی ئارام بگرێت تا دەگەیشتنەوە هۆتێلەکە.

- میترۆیەکە نیمچە چۆڵە عبدالعزیز، دەتوانین بێ دوودڵی لێرە قسە بکەین، ئێستا پێم بڵێ لەو هۆڵە چیت بینی؟

- زۆر شتم بینی نیزال، نەمدەزانی سەردانکردنی مۆزەخانەکان هێندە چێژبەخشە، بۆچی پێشتر منت بۆ سەردانە بەردەوامەکانت بۆ مۆزەخانەی لەندەن لەگەڵ خۆت نەدەبرد؟

- تکا دەکەم هاوڕێ، ئێستا کاتی گاڵتەکردن نییە، خەریک بوو دڵم دەوەستا کاتێک لە هۆڵەکە بوویت، ئێستا پێم بڵێ لەوێ چیت بینی؟

- هۆڵەکە زۆر گەورە بوو نیزال، پڕبوو لە کەلوپەلە تایبەتییەکانی سەرکردە خیرالدین بەربەرۆسا، هەروەها پڕ بوو لە پەیکەری تۆپ و کەشتییەکانی، هەروەها سەر دیوارەکانی پڕبوون لە وێنەی هەڵواسراو و لەبەردەم هەر شتێکیش کارتێکی ژمارەکراوی بچوک هەبوو کە هەندێک زانیاری بە زمانی تورکی لەسەر نوسرابوو، بەدوای کارتی ژمارە ١٠٢ گەڕام، بینیم لەبەردەم پەیکەری کەشتییەکی جەنگییە و لەدواوەشی وێنەیەک لەسەر دیوارەکە

هەڵواسرابوو، هیچ لە نووسینی سەر کارتەکە تێنەگەیشتم جگە لەیەک وشە، ئەویش وشەی ( Fransa)، پێم وایە ئەویش ئامارژەیە بۆ وشەی فەرەنسا بە زمانی تورکی.

- عبدالعزیز، بەتەواوی پێم بڵێ شێوەی کەشتیەکە چۆن بوو؟

- کەشتیەکە لاکانی پڕبوون لە سەوڵ و لە کۆتا بەشی کەشتییەکە ئاڵای بەربەڕۆسا هەبوو وەکو ئەوەی سەر هۆڵی بەربەڕۆسا، هەروەها کۆمەڵێک ئاڵای تریشی لەخۆ دەگرت کە مانگی تورکی و شمشێری دووسەری تێدابوو، کە لە نهێنی بەربەڕۆسا هەبوو.

- جوانە، وادیارە هەر هێمایەک لە ئاڵای بەربەڕۆسا ئامارژە دەکات بە شوێنێکی دیاریکراو، هەروەها دەستەواژەی (وبشر المؤمنین یا محمد) کە لەسەرەوەی ئاڵای بەربەڕۆسایە ئامارژە دەکات بە شاری ئیستەنبوڵ، کە پڕ لەم دەستەواژەیە لەسەر مزگەوتەکانی و شوێنەوارە عوسمانییەکانی و، شمشێری دوو سەریش هێمایە بۆ کەشتی جەنگی سەرەکی کە خیرالدین بەربەڕۆسا سواری ببوو لە کاتی سەرکردایەتیکردنی کەشتیگەلی دەریایی ئیسلامی عوسمانی، بۆ ڕزگارکردنی فەرەنسا پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی داگیرکەران.

عبدالعزیز بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- وتت چی؟! کەشتیگەلی ئیسلامی فەرەنسا ڕزگار دەکات!

- بەڵێ عبدالعزیز، لە ساڵی ١٥٢٥ز دوای جەنگی (بافیا) (Battle of Pavia) کە تیایدا فەرەنسا شکستی هێنا بەرانبەر پاشای ئیسپانیا و ئیمپراتۆری ڕۆمانی، کە تیایدا پاشای

فەڕەنسا (فرانسـوای یەکەم) بە دیـل گیـرا و (لـویز دی سـافوا)ی دایکی پاشـایی فەڕەنسـا نـامەیەکی بەهانـاوەچوونی بـۆ خەلـیفەی مسوڵمانان، سوڵتانی عوسمانی (سولەیمانی قـانونی) کە لە ڕۆژئـاوا بە نـاوی (Suleiman the Magnificent) (سـولەیمانی گەورە)ناسراوە ناردو داوای لێکرد کوڕەکەی ئازاد بکات، بەڵام نامەکە نەگەیشتە سوڵتان و لە ڕێگای بۆسنە بەرەو ئیستەنبوڵ ون بوو، لەم ئـان و سـاتەدا پاشـای فەڕەنسـا ئـازادکرا دوای ناچـارکردنی بە ئیمزاکردنـی (ڕێکەوتنـی مەدریـد) کە خۆبەدەسـتەوەدانێکی زۆری تێدابوو بۆ فەڕەنسا، دوای گەڕانەوەی بۆ فەڕەنسا، فرانسوای یەکەم لە دیسـێمبەری سـاڵی ١٥٢٥ز لە ڕێـگەی نێـردراوەکەی (لـویس فرنجبانی) نامەیەکی بۆ سوڵتان ناردو تێیدا ئاماژەی بەوەکردبـوو کە لەلایەن دوژمنـی هاوبەشـیانەوە چـی بەسـەر هـاتووە، سـوڵتانی عوسمانی بە نامەیەک وەڵامی دایەوە کە تێیدا هاتبوو: (انا سلطان السلاطين , وبرهان الملوک , ومتوج العروش ظل الله فـي الأرضـين , سلطان البحـر الأبـيض والبحـر الأسـود والبحـر الأحمـر والأناضـول و الروملـي وقرمـان الـروم وولايـة ذي القدريـة وديـاربكر وكردسـتان واذربيجان و دمشق وحلـب و مصـر ومكـة والمدينـة والقـدس وجميـع ديار العرب واليمن , ان هذة الأراضـي الشاسعة قد فتحها آبائي الكرام واجدادي العظام بقوتهم القاهرة رحمهم الله , وكم من الـبلاد افتتحتهـا بسيفي الظافر المنصـور , مـن السـلطان سـليمان خـان بـن السـلطان سليم خان بن السـلطان بايزيـد خـان , الـي فرانسـيس ملـک مقاطعـة فرنسا , وصـل الي اعتاب ملجا السلاطين المكتوب الذي ارسلتموه مع

تابعكم " فرانجباتي" النشيط , مع بعض الأخبار التي اوصيتموه بها شفاهيا , واعلمنا ان عدوكم استولى على بلادكم وانكم الآن محبوسين وتستعدون من هذة الجانب مدد العناية بخصوص خلاصكم , وكل ما قلتموه عرض على اعتاب سرير سدتنا الملوكانية , و احاط به علمي الشريف على وجه التفصيل , فصار بتهامه معلوما , فلا عجب من الحبس الملوك وضيقهم , فكن منشرح الصدر ولا تكن مشغول الخاطر , فان آبائي الكرام و اجدادي العظام نور الله مراقدهم لم يكونوا خاليين من الحرب لأجل فتح البلاد ورد العدو , ونحن ايضا سالكون على على طريقهم , وفي كل وقت تفتح البلاد الصعبة والقلاع الحصينة , وخيولنا ليلا ونهارا مسروجة و سيوفنا مسلولة , فالحق سبحانة وتعالى ييسر الخير بارادتة ومشيئته , واما باقي الأحوال والأخبار تفهمونها من تابعكم المذكور , فليكن معلومكم هذا. تحريرا في اوائل شهر آخر الربيعين سنة ٩٣٢ هجري/ ١٥٢٥م , بمقام دار السلطنة العلية القسطنطينية المحروسة المحمية)).



" إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ"

أنا سلطان البحر الأبيض والبحر الأسود والبحر الأحمر والأناضول والروملّي وقرمان الروم وولاية ذي القدرية وديار بكر وكردستان وأذربيجان والعجم والشام ومصر ومكة والمدينة والقدس وجميع ديار العرب والعجم وبلاد المجر والقيصر وبلاد أخرى كثيرة إفتتحتها يد جلالتي بسيف الظفر

ولله الحمد.... والله أكبر

أنا السلطان سليمان بن السلطان سليم بن السلطان بايزيد

(إلى "فرانسيس" ملك ولاية فرنسا، وبعد... )

جیهانبینییەکی فراوان بوو، دەیزانی بە هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کە لەسەردەمی سوڵتان سولەیمان بەهێزترین دەوڵەتی جیهان بوو، دەوڵەتەکەی پارێزراودەبێت لە چاوچنۆکی ئیسپانی و هەنگارییەکان کە بەناوی ئیمپراتۆریەتی پیرۆز زۆربەی خاکی ئەوروپایان داگیر کردبوو، ئەم هاوپەیمانییە لە نێوان عوسمانی و فەرەنسییەکان نزیکەی سێ سەدە بەردەوام بوو.

- بەڵام نیزال دەوری بەربەرۆسا لەم هاوپەیمانیەتییە چی بوو؟

- لە هاوینی ساڵی ١٥٤٣ز سوڵتان سولەیمانی عوسمانی فەرمانی بە سەرکردەی کەشتیگەلی دەریایی عوسمانی خیرالدین بەربەرۆسا کرد بەرەو فەرەنسا بەرێبکەوێت بۆ یارمەتیدانی فەرەنسییەکان لە رزگارکردنی شاری (نیس)ی فەرەنسی، بەربەرۆسا بە یاوەری سەد کەشتی جەنگی و ٣٠ هەزار جەنگاوەری عوسمانی بەرەو فەرەنسا بەرێکەوت، بە گەیشتنی هێزی عوسمانی بۆ بەندەری (مەرسیلیا) هێزی دەریایی فەرەنسیشی هاتەپاڵ، کە لە ٥٠ کەشتی فەرەنسی پێکهاتبوون، ئەم کەشتیگەلە عوسمانی فەرەنسییە بە سەرکردایەتی بەربەرۆسا توانی بەسەر هێزی کەشتیگەلی هاوبەشی هەریەکە لە کەشتیگەلی (دۆقیە سافۆی) کە شارەکەی داگیرکردبوو، هەروەها هێزی کەشتیگەلی (ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز)، (کۆماری جێنەوای ئیتالی) سەرکەوێت و توانی شارەکە ئازادبکات.

- عبدالعزیز پرسی: دوای ئەوە چی روویدا؟

دوای ئەوەی پاشـــای فەڕەنســـا هێـــزی ئەم ئەفســـان عوسمانییەی بینی، فرانسوای یەکەم پێشنیاری کرد عوسمانیەکان بنکەیەکی سەربازی لە بەندەری (تۆلۆن) دروستبکەن، ئەم بەندەرە فەڕەنسییە بـووە بنکەیەکـی دەریـایی بـۆ دەرچـونی کەشتیگەلی عوسمانی بۆ بەرپەرچدانەوەی هێزی دەریایی ئیسپانی و ئیتالی، ئەمەش لە پێناو زامنکردنی ئاسایشـی فەڕەنسـا لە دەسـتدرێژیەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز بە بوونی بنکەیەکی سەربازی عوسمانی لەسـەر خـاکەکەی، لەپێنـاو ڕازیکردنـی بەربەرۆسـا بەم پێشـنیارە فرانسـوای یەکەم بەڵێنیـدا فەڕەنسـا یـارمەتی بـدات لە ئـازادکردنی تـونس لە داگیرکـارە ئیسـپانییەکان بەو مەرجەی عوسـمانییەکان بە درێژایـی زسـتان لە بەنـدەری تۆلـۆن بمێنـنەوە، دوایـی وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی سـوڵتان، بەربەرۆسـا بەم پێشـنیارە ڕازیبـوو، بـۆیە عوسـمانییەکان بنکەیەکـی سـەربازیان لە شـاری تۆلـۆن دانـا و ئەم شـارە بـووە بنکەیەکـی دەریـایی عوسـمانی بـۆ پـاراسـتنی فەڕەنسـا، لەبەرئەوە پاشـای فەڕەنسـا بەشـێوەیەکی کـاتی کەنیسـەی تۆلـۆنی کردە مزگەوت بۆ ئەوەی سەربازە عوسـمانییەکان نـوێژی تێـدا بـکەن کە ژمارەیان بە ٣٠ هەزار سەرباز مەزەندە دەکرا، بـۆ مـاوەی شـەش مانگ لە کۆتایی ساڵی ١٥٤٣ز تاوەکو سـەرەتای سـاڵی ١٥٤٤ز. ئەم شارە فەڕەنسییە گۆڕا بـۆ بنکەیەکی جەنگی بـۆ دەرچـونی هێرشـی عوسمانیەکان و لەم ماوەیەدا فەڕەنسا نزیکەی ١٠ ملیـۆن کیلـۆگرام نـانی بەخشـیە ئەم بـنکەیە، لەم مـاوەیەدا دراوی کـارپێکراویش لە شاری تۆلۆن بووە دراوی عوسـمانییەکان، بەداخەوە لە هەمـان شـار

کە عوسمانییەکان بنکەیان دامەزراند بۆ پاراستنی فەرەنسییەکان، (ناپلیۆن پۆناپارت) هێرشەکانی بۆسەر زەوی خەلافەتی عوسمانی لە مصر لەساڵی ١٧٩٨ز دەستپێکرد.

- جیاوازییەکی سەیرە! بەڵام ئەمە واتای ئەوەیە ئەو وێنەیەی لە مۆزەخانەی ئیستەنبۆڵ بینیم بریتییە لە کەشتیگەلی بەربەرۆسا کە بۆ بەرگری کردن لە فەرەنسا بەڕێدەکەوێت؟

- بەڵی ڕاستە، ئەمەش نهێنی بوونی ناوی فەرەنسایە لەسەر کارتی ژمارە ١٠٢، بەڵام کۆمەڵێک وێنەی ناودار هەن کە باس لەم قۆناغە دەکەن، بۆ ئەوەی بزانین تۆ کام وێنەت بینیوە، سەرەتا باسی وردەکاریەکانی ئەو وێنەیەم بۆبکە.

عبدالعزیز بەدرێژی دەستیکرد بە گێڕانەوەی وردەکاریەکانی وێنەکە، عبدالعزیز لە ناو هاورێکانی بەوە ناسراوبوو یادگەیەکی بەهێزی هەیە، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی هەڵبژاردنی بوو لەلایەن نیزال تا لەم قۆناغە لەگەڵی بێت، لە کاتی گێڕانەوەی وردەکاریەکانی وێنەکە نیزال لەناکاو قسەکانی پچڕاند و گوتی:

- بەدڵنیایەوە دەبێت ئەوە وێنەی چونەژوورەوەی بەربەرۆسا و کەشتیگەلی عوسمانی بێت بۆ بەندەری تۆلۆن کە لەلایەن (نسوح سەلاحی) کێشراوە!



**وێنەی چونەژوورەوەی بەربەرۆسا و کەشتیگەلی عوسمانی بۆ بەندەری تۆلۆن، (نسوح سەلاحی) کێشاویەتی.**

- عبدالعزیز پرسی: نسوح سەلاحی کێیە؟
- نسوح ئەفەندی سەلاحی، یەکێکە لە بەناوبانگترین مێژوونووسەکانی دەوڵەتی عوسمانی، زانایەکی بۆسنییە، نووسەر، شاعیر، ئەندازیار، بیرکاریزان، مێژوونوس، جوگرافیناس و وێنەکێش بوو، ئەم مێژوونووسە بۆسنییە کەسێکی بەختەوەر بوو چونکە هاوسەردەمی دوو لە گەورەترین سوڵتانە عوسمانییەکان بوو، سوڵتان سەلیمی یەکەم و سوڵتان سولەیمانی قانونی، لە سەردەمێکدا ژیاوە کە پڕبووە لە جەنگ و ڕووداوی گرنگ و لەدوای خۆی سەلاحی دەیان نوسراوی جێهێشتووە کە پڕن لە وێنەو نەخشە و نووسین و، وردەکاریەکانی یەکێک لە گرنگترین سەردەمەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ پاراستوین.

- بەڵام ئەم مێژوونووسە بۆسنییە چۆن توانیویەتی وردەکاری ئەم سەردەمە پڕ لە ڕووداوە لە نوسراوەکانی جێبکاتەوە؟

- عبدالعزیز هەندێک جار نزیکبوونەوەی زاناو دەسەڵاتدارەکان دەبێتە کێشە بۆ هەردوو لایان، بەڵام هەندێک جار نزیکی زانا لە دەسەڵاتدار نیعمەتێکە کۆمەڵە شتێکی دەخاتە بەردەست کە بۆ کەسانی تر بەردەست نییە بۆ بڵاوکردنەوەی زانستەکەی، بەتایبەت ئەگەر ئەم دەسەڵاتدارە زانست و زانایانی خۆشبوێت، نموونەی ئەم کەسانەش لە مێژوی ئیسلامی زۆرن، توانای سەلاحی لە زانستە جۆراوجۆرەکان و سەرەڕای زانینی پێنج زمان وای لێ کرد ببێتە نووسەری دیوانی سوڵتانی، بۆیە بووە هاوەڵی سوڵتان سەلیمی یەکەم و لەدوای ئەو کوڕەکەی سوڵتان سولەیمانی قانونی، سەلاحی توانایەکی لە ڕادەبەدەری لە نووسین و وێنەکێشان هەبوو، بۆیە بە تۆمارکردنی هێرشە سەربازییەکان کە خۆی شایەدحاڵ بووە تیایاندا ڕاسپێردرا، بۆیە نووسینەکانی بۆتە تێکەڵەیەک لە ئەدەبی گەشت و شیعر و پەخشان، هەروەها ئەندازیاریی و ژمێریاریی، سەرەڕای ڕازاندنەوەی بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی شار و ماڵ و ڕێگە و بەناوبانگترین ئەو شوێنانەی کە هێزی سەربازی عوسمانی لە کاتی هێرشەکانی پیایدا تێپەڕیوە، ئەو وێنەیەش کە تۆ بینیوتە یەکێکە لە بەناوبانگترین وێنەکانی، کە لەڕێگەیەوە چوونەناوەوەی کەشتیگەلی عوسمانی بۆ شاری تۆلۆنی فەڕەنسی بە سەرکردایەتی بەربەرۆسا کردووە بە دۆکیومێنت.

- ئەمانە هەمووی قسەی جوانن نیزال، بەڵام پەیوەندی بە نهێنی بەریەڕۆساوە چییە؟ ئێستا دەبێت بەرەو کوێ بچین؟ من شاری تۆڵۆن باش شارەزام، یەکێک لە ئامۆزاکانم ساڵانێکە لەوێ دەژیت و چەند جارێک لەو شارە سەردانم کردووە، بەداخەوە دەبێت پێت بڵێم تۆڵۆن شارێکی گەورەیە و گەڕان بەدوای تەلی دواتری نهێنییەکەمان کاتێکی زۆری پێویستە!

- نیزال بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە: کێ وتوویەتی کە پێویستە ئێمە هەموو شارەکە بگەڕێین؟

- مەبەستت چییە نیزال؟

- تکایە ساتێک چاوەڕوان بە.

- لەم ساتەدا نیزال مۆبایلەکەی دەرهێنا تاوەکو بەدوای وێنەی چوونەناوەوەی بەربەرۆسا بۆ شاری تۆڵۆن بگەڕێت لە تۆڕی ئینتەرنێت کە نسوحی مێژوونووس کێشاویەتی.

- ئەمە هەمان وێنە نییە کە پێش کەمێک تۆ لە مۆزەخانەکە بینیت؟ نیزال پرسیاری لە عبدالعزیز کرد و ئامارەی بۆ شاشەی مۆبایلەکەی کرد.

- بەڵێ ئەمە هەمان وێنەیە کە پێش کەمێک لە مۆزەخانەکە بینیم.

نیزال دەستی لەسەر وێنەی تەنها بینایەک دانا لە نزیک سوچی خوارەوەی لای راستی وێنەکە و بە عبدالعزیزی وت:

- ئێمە تەنها لەم بینایە دەگەڕێین عبدالعزیز.

- ئەم بینایە چییە نیزال؟

- هاورێ ئەمە قەڵای تاوەر ڕۆیاڵە (Tour Royal) ، ئەم قەڵایە وەکو کۆگای چەک لە کاتی مانەوەی بەربەرۆسا لە شاری تۆڵۆنی فەرەنسی بەکارهاتووە.

- پرسیارێک بە خەیاڵمدا هات نیزال، وادیارە ئەو کەسەی نهێنی بەربەرۆسای داناوە ویستوویەتی هەنگاوی دواتری دۆزینەوەی نهێنی بەربەرۆسا ببەستێتەوە بە چەک و جەنگ، هێمای دیاری وێنەی ئاڵای بەربەرۆسا کە ڕاستەوخۆ لەدوای دەقی (وبشر المؤمنین یا محمد) دێت، بریتییە لە: شمشێری دووسەر کە ڕاستەوخۆ لە ناوەڕاستی ئاڵاکەدا هاتووە، هەروەها ئەو کەشتییەی بەربەرۆساش کە لای کارتی ژمارە ١٠٢ بینیم کەشتییەکی جەنگی بوو، ئاڵای دیاری ئەم کەشتیەش ئاڵای شمشێرە، تەنانەت شێوەی هەندێک لە ئاڵاکان وەکو شمشێری دووسەرە، وێنە هەڵواسراوەکەش بەرەوپێشچوونی کەشتییە جەنگییەکانی بەربەرۆسای پیشاندەدا بەرەو بەندەری تۆڵۆن، گۆڕانی ئەم بەندەرەش بۆ بنکەیەکی سەربازی هێمایە بۆ چەک و جەنگ، تەنانەت ئەو مێژوونووسەش کە ئەم وینەیەی کێشاوە ناوی (سیلاحی) یە!.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایە ئەو کەسەی ئەم مەتەڵە سەیرەی داناوە مەبەستی بەیەکەوەبەستنی ئەم هەموو هێما پەیوەندیدارەی بەو شێوە سەیرە هەبووە یان ئەمە تەنها ڕێکەوتێکی پلان بۆ دانەندراوە؟!

نیـزال زەردەخەنەی دەکـردو بە وریـایەوە گـوێی بـۆ شـیکارەکەی عبـدالعزیز گرتبـوو، بەڵام وەڵامـی پرسـیارەکەی نەدایەوە، پاشـان دووبارە مۆبایلەکەی هەڵگرتەوە، تـاوەکو دوو بلیـت بـۆ فڕۆکەخانەی شـارڵ دیگـۆڵی نێـودەوڵەتی بکڕێـت، بـۆ ئەوەی دوو هـاوڕێکە بە یەکەوە بەدوای هێڵی دواتری نهێنی بەربەرۆسا بگەڕێن لە فەرەنسا.

❊❊❊

## تاوەر ڕۆیاڵ

نیـزال و عبـدالعزیز لە شـاری تۆڵـۆن بەرەو قەڵای تـاوەر ڕۆیـاڵ دەڕۆیشـتن، کە ببـوویە شـوێنێکی گەشـتیاری گەورە بـۆ ئەم شـارە فەرەنسییە.

- عبـدالعزیز تـۆ بـۆ وەکـو ئـامۆزاکەت چێشـتلێنان فێرنابیـت؟ (تاجینی مەغریبی) کە دوێنێ ئێـوارە پێشـوازی پێکـردین زۆر بەتـام بوو، ئەگەر تۆش وەکو ئەو کارامە باییت لە ئامـادەکردنی خـواردن، پێویستی نەدەکرد وەکو بێلانەکان لە شەقامەکانی لەندەن وێڵ بین بەدوای ئەو خواردنگانەی زوو داناخرێن.

- هۆکارەکەی بۆ دایکم دەگەڕێتەوە، وەکـو دەزانـی دایکم لە ماڵەوە بەرگدورێتی دەکات، بۆیە کـاتی پێویسـتی هەیە بـۆ خـواردن ئامـادەکردن، هەمیشـە لە کـاتی گەڕانەوەم لە قوتابخـانە خـواردن لەبەردەمم بووە، بەڵام دایکی کوڕە مامەکەم لە قوتابخـانەیەکی دوور لە شـار مامۆسـتا بـوو، بۆیە ئـامۆزاکەم و براکـانی زۆر جـار خۆیـان

خۆراکیان ئامادە دەکرد، بۆیە بووە چێشتلێنەرێکی بەتوانا، لە کاتێکدا من بەم شێوەیە مامەوە و چاوەڕێی چێشتی دایکم بووم.

- نیزال بەدڵتەنگییەوە گوتی: ئەوە هەمان هۆکارە وای لەمنیش کرد فێری چێشتلێنان نەبم، پورم خودا بیبەخشێت وەکو مامۆستایەکی تایبەتی لە ماڵەوە کاریدەکرد، بۆیە کاتی هەبوو خۆشترین خواردن ئامادەبکات.

- بەم بۆنەیەوە نیزال، داوای لێبوردنت لێ دەکەم کە نەمتوانی لەو بارودۆخە سەختە لە غەزە لەگەڵت بم، بەڵام خۆت دەزانی دڵتەنگیم بۆ پورت لە دڵتەنگی تۆ کەمتر نەبوو، خودا بیبەخشێت، هەرچەندە لە ژیانم نەمبینیبوو، بەڵام هەستم بەدڵخۆشییەکی زۆردەکرد، کاتێک جار جارە تەلەفۆنی بۆ دەکردم تاوەکو لە هەواڵی تۆ دڵنیاببێتەوە، نیزال پورت هێندە خۆشی دەویستی کە وەسف ناکرێت، دەیویست لەڕێی منەوە هەموو وردەکاری ژیانت ئاگاداربێت، منیش دەمویست سوود لەو پەیوەندیانە وەرگرم بۆ وەرگرتنی جۆرێک ئومێد لەڕێی وتە و ئامۆژگاریەکانی، هەرچەندە بەتەمەن زۆر لە ئێمە گەورەتر نەبوو، بەڵام ئەزموونەکانی ژیانی لە ئەزمونی پیاوێکی پیر زیاتر بوو، تەنانەت پێش ئەوەی بیبینم دەمویست بیناسم، دوای ئەوەی تۆ باسی ئەوت بۆکردم، کە چۆن دوای لەدەستدانی دایک و باوکت لە پشتت وەستاوە، وای لێ کردم خۆشەویستییەکی زۆر بۆ ئەم مرۆڤە باشە لە ناخم پەنگبداتەوە وەکو ئەوەی دایکی منیش بێت، ئەوەی کە بەسەری

هـات كارەسـاتێكە دڵ دەتـوێنێتەوە، بەڵام ئەوە قەدەری خودایە و رەخنەی لێ ناگیرێ.

- سوپاس بۆ خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێک، دەزانـی عبدالعزیز دوای ئەوەی مێردی پورم پەیوەندی پێوەکردم و بۆی باسکردم چی رویداوە، توشی شۆکێکی بەهێزبووم، بەجۆرێـک نەمـدەتوانی بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە، وام هەستدەکرد هەموو خوێنی لەشم لەسەرمدا کۆبۆتەوە و خەریکە بتەقێت، تەنانەت ساتێک بورامەوە و تاکە شت کە هەستم پێدەکرد لێدانی دڵـم بـوو، کە بەرەبەرە نـرم دەبـویەوە، بـۆیە کەوتـمە سـەرچۆک، دوای ئەوەی توانـای وەسـتانم نەمـا و وا هەستم دەکرد کە خەریکە لێدانی دڵم بە یەکجاری دەوەستێت، دوای ئەوەی هەنەسـەدانم بە تەواوی قـورس بـوو، لەم سـاتەدا زەردەخەنەکانی پوورە خەدیجەم بیرکەوتەوە لە کاتی منداڵیم کاتێک بە گریانەوە گلەیی ئەو سەختیانەم دەکرد کە دێنە رێگای ژیانم بە سنگییەوەی دەگوشـیم و بە دەسـتە بەسـۆزەکانی فرمێسـکەکانمی دەسـڕی و بەوپەڕی دڵنیـاییەوە پێـی دەوتـم:

-دڵتەنگ مەبە، هەمـوو شـتێک بـاش دەبێـت، قەدەری خـوای گەورە هەمـووی چـاکەیە بـۆت، تەنـانەت ئەگەر تـۆش لەسـەرەتاوە ئەوە نەبینی، رۆژێک لەرۆژان دەیبینی، بشزانە تـاریکترین کـاتی شـەو ئەو کاتەیە کە دەکەوێتە پێش بەرەبەیان، شـەوەکان هەرچەنـدە درێـژبن بەردەوام نابن، هەمیشە ئەم وتەیەی خوای گەورەت لەیـات بێـت کە دەفەرموێت:( وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَـالُوا إِنَّـا لِلَّهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ رَاجِعُـونَ (١٥٦)

کاتێک ئەم قسانەی پورم بیردەکەوێتەوە، هەست بە ئارامییەکی سەیر دەکەم، وا هەستدەکەم دووبارە دڵم لێ دەداتەوە، خوێن دووبارە لە دەمارەکانم هاتوچۆ دەکات و هەمیشە ئەم رستەیە لەسەر زارمە: (انـــا للـــــه وانـــا اليــــه راجعـــــون).

لەم ساتەدا هاورێکان گەیشتنە قەڵای تاوەر رۆیاڵ و سەرکەوتنە سەر بانە چەماوەکەی و لەوێوە سەیری دەریای سپی ناوەڕاستیان دەکرد.



- دەزانی عبدالعزیز ئەم قەڵایە لە سەردەمێک لە سەردەمەکان لە پارستنی گیانی سەدان کەس بەژداری کردووە؟

- چۆن نیزال؟

- لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەی زاینی تاوەر رۆیاڵ بووە شوێنێک کە فەرەنسییە پرۆتستانتەکان خۆیان تێدا دەشاردەوە،

ئەمەش دوای بیستنی هەواڵی کوشتارگەی (سانت بارتیلمی)ترسناک.

- چیرۆکی ئەم کوشتارگەیە چییە کە باسی دەکەی؟

- کوشتارگەی (سانت بارتیلمی) (St. Bartholomewes Day massacre) لە ساڵی ١٥٧٢ز لە شاری پاریسی فەرەنسا ڕوویدا، تێیدا ٣٠ هەزار مەسیحی پرۆتستانت لەسەردەستی هاونیشتیمانییەکانیان لە مەسیحییە کاسۆلیکەکان سەربڕدران، ئەمەش بە ئاگاداری دەسەڵات و کەنیسەی کاسۆلیکی، ئامانج لەم کوشتارگەیە لەناویردنی یەکجاری پرۆتستانتەکان بوو، دوای دەرچوونی فەرمانی لەناوبردنیان و ڕێگریکردن لە بڵاوبونەوەی مەزهەبی پرۆتستانتی لە لایەن پاشای فەرەنسا (شارلی نۆیەم)، بەداخەوە کەنیسەی کاسۆلیکی دەستی ڕاستەوخۆی هەبوو لەم کوشتارگە ترسناکە! لە ڕۆژی ٢٤ی ٨ ی ١٥٧٢ قەشە کاسۆلیکەکان چاوەڕێی زەنگی کەنیسەکانیان بوون تاوەکو ئاماژەی دەستپێکردن بدەنە سەرباز و خۆبەخشە توندڕەوە کاسۆلیکەکان کە شەوە بەبێداری مابونەوە و چاوەڕوانی کاتژمێری سفریان دەکرد بۆ هێرشکردنە سەر بڕا پرۆتستانتەکانیان، کاتێک زەنگی کەنیسەکان پێش کاتی دیاریکراوی نوێژ لێدران، پرۆتستانتەکان هەستیان بەمەترسی کرد، هەندێکیان بە منداڵەوە بەرەو دەرەوەی شار ڕایان کرد، هەندێکیشیان خۆیان پەنادا لای کەسە کاسۆلیکەکانیان، بەڵام ئەم کوشتارگە کوێرانەیە تەواوی ئەوانەی گرتەوە، ئەو کەسانەشی نەیانتوانی ڕابکەن بە منداڵەوە

ماڵەکانیان بەسەر ویرانکرا، بەشێوەیەک بووە پەڵەیەکی ڕەشی مێژوو، ئامارەکان دەربارەی ژمارەی کوژراوەکان جیاوازن، هەندێک لە مێژوونووسەکان ژمارەی قوربانییەکان بە ٦٠ هەزار کوژراو دەخەملێنن.

- خودایە! نەمدازانی فەڕەنسایی عەلمانی ئەو هەموو مێژووە خوێناوییەی لەسەر بنەمای دەمارگیری ئایینی هەیە!

- بەداخەوە عبدالعزیز، ئەمە هۆکاری ئەوەیە زۆرێک لە فەڕەنسییەکانی ئێستا دژایەتی هەرشتێک دەکەن پەیوەندی بە ئایینەوە بێت، یەکێک لە گرنگترین دروشمەکانی شۆڕشی فەڕەنسی دروشمەکەی ( ڤۆڵتێر)ی فەیلەسوف بوو کە دەیگوت: (کۆتا پاشا بە ریخۆڵەی کۆتا قەشە لە سێدارەبدەن)، بۆیە دەکرێت لە ڕقی فەڕەنسییەکان لە ئایین تێبگەین، لە میانی مێژووی خوێناوی کەنیسەی کاسۆلیکی لە سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵام ئەمە نابێتە پاساو تا مرۆڤ لە توندڕەوی ئایینی بەرەو توندڕەوی عەلمانی بڕوات، توندڕەویی بە هەموو جۆرەکانییەوە، هۆکارە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ دەورووبەری هەڵنەکات، بۆیە هەمیشە توندڕەوەکان یەکێک لەم دوو بژاردەیە هەڵدەبژێرن، یان بەتەواوی لە کۆمەڵگاکەیان دادەبڕێن کە تێیدا دەژین یاخود هەوڵدەدەن لەهەموو ئەو کەسانە خۆیان ڕزگار بکەن کە ڕای جیاوازیان هەیە، بەڵام مرۆڤی ژیر دەزانێت کە خودا هەمووانی وەکو یەک دروست نەکردوە، بەڵکو بیرکردنەوەی کەسێک لەگەڵ کەسێکی تر جیاوازە، تەنانەت بیرکردنەوەی هەمان کەس لە کاتێک بۆ کاتێکی دیکە جیاوازە، ئەو

شتەی لای تۆ ڕاستە لای بەرامبەرەکەت هەڵەیە، ئەو شتەش لای تۆ هەڵەیە لای ئەو ڕاستە، هەروەها مرۆڤ هەرچەندە زانستی زیادبکات دونیابینی فراوان دەبێت، لە پەنجەرەی فڕۆکەیەکەوە هەرچەندە زیاتر بەرز ببینەوە بواری بینینمان زیاد دەکات، هەربۆیە گفتوگۆ و بەڵگەهێنانەوە و قسەی باش باشترین ڕێگان بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتری، تەنانەت ئەگەر نەشتوانی بە وتەکانت بەرانبەرەکەت باوەڕ پێبێنی، تۆ بە ئەرکی سەرشانت هەڵساوی، لە کۆتاییشدا مرۆڤەکان خۆیان ڕێگای ژیانیان هەڵدەبژێرن و هەر خۆیان بەرپرسیان بەرامبەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان.

- وتەکانت جوانن ۱۰۱، بەڵام پێم بڵێ ئێستا دەبێت لە کوێ بەدوای ژمارە ۱۰۳ دا بگەڕێین؟

نیزال مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، تاوەکو سەیری وێنەی چونەژوورەوەی بەربەرۆسا بکات بۆ شاری تۆلۆن، پاشان ئاماژەی بە وێنەکە کردو بە عبدالعزیزی گوت:

- عبدالعزیز سەیری شێوەی قەڵای وێنەکەی سەلاحی بکە، تاکە شت کە دیارە بریتییە لە شەش پەنجەرەی ڕوو بە دەریا، پێم وایە دەبێت بە دیاریکراوی لەو پەنجەرانە بگەڕێین، تۆ برۆ لە سێ پەنجەرەکەی خوارەوە بگەڕێ، منیش لە سێ پەنجەرەکەی سەرەوە دەگەڕێم، دوای تەواوبونیش لەهەمان شوێن یەکتر دەبینینەوە.

دوای نزیکەی نیو کاتژمێر دوو هاوڕێکە لە هەمان شوێن چاویان بەیەکتری کەوتەوە و نیزال بە عبدالعزیزی گوت:

- بەداخەوە هیچ شتێکم نەدۆزیەوە کە پەیوەندی بە بەریەڕۆسا یان ژمارە ۱۰۳ەوە بێت، هەموو ئەو نووسراوانەی بینیم لەسەر دیواری سێ پەنجەرەکە بریتی بوو لە: یادگاری گەشتیارەکان بە زمانە جیاوازەکان.

- هەروەها منیش نیزال، هیچ شتێکم نەدۆزیەوە پەیوەندی بە ژمارە ۱۰۳ەوە بێت، بەڵام ئەو پەنجەرەیەی دەکەوێتە لای ڕاست کۆمەڵێک ژمارە و هێمای لەسەربوو کە لێیان تێنەگەیشتم.

- بە دیاریکراوی چیت بینی عبدالعزیز؟

- شتێکی گرنگ نەبوو، تەنیا وێنەیەکی پێکەنیناوی کەشتییەک کە وا دیارە منداڵێک کێشاویەتی، وێنەی کەشتیەک بە ژمارەکی زۆر سەوڵەوە، بەڵام ئەم کەشتیە لەناو دەریادا ناڕوات، بەڵکو لەسەر بناغەیەکی بەردی چەسپکراوە، لەژێرەوەشی لە ژمارەیەک لە نافورەکانی دەوروبەری ئاو هەڵدەقوڵێت، لە ژێر کەشتیەکەشەوە کۆمەڵێک ژمارە بەشێوەیەکی زنجیرەیی ڕیزکراون.

- نیزال بەپەرۆشەوە پرسی: ئەو ژمارانە چی بوون عبدالعزیز؟

- ژمارەکان ڕیزکراون بەم ڕێگایە:

۱, ۱, ۲, ۳, ٥, ۸, ۱۳, ۲۱, ۳٤, ٥٥, ۸۹, ۱٤٤, ۲۳۳, ۳۷۷ ژمارەکانی ترم لەیاد نییە، نیزال وێنەیەکم لەوێنە و ژمارەکان گرتووە بە مۆبایلەکەم.

نیزال هەرکە سەیری وێنەکەی کرد چاوەکانی گەشانەوە و زەردەخەنەیەکی کرد و پاشان وتی:

- چۆن لەسەرەتاوە لەوە تێنەگەیشتم؟!

- عبدالعزيز بە سەرسوڕمانەوە پرسی: لەچی تێنەگەیشتی؟
- لەسەرەتاوە نەدەبوایە بەدوای ژمارە ١٠٣دا گەڕابایین، بەڵکو لەسەر پەنجەرەی چوارەم لە شەش پەنجەرەکە کە لە وێنەکە دیارن، ژمارە ١٠٣ لە هەرسێ ژمارەی ١ و ٠ و٣ پێکدێت کۆی ئەو سێ ژمارەیەش دەکاتە ٤، بۆیە عبدالعزیز تۆ هێڵی بەربەرۆسات لە پەنجەرەی لای ڕاستی خوارەوە دۆزیەوە، ئەویش پەنجەرەی چوارەمە.
- بەڵام نیزال ئەوە تەنها کەشتییەکی پێکەنیناوی و کۆمەڵێک ژمارەی بێواتایە.
- هاوڕێ ئەم ژمارانە واتایەکی زۆریان هەیە، ئەو ژمارانە بریتین لە (بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی)!
- بەدوایەک داهاتنی چی؟ ئەی خوایە، سەرلەنوێ دەست پێمەکەوە ١٠١!!!

***

## بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی

- نیزال من پێشتر پێم نەوتبووی تکایە ئەو ناوانە بەبێ شیکردنەوە بۆمن باسمەکە؟ ئەو سەرسامییەی بەهۆی نهێنی بەربەرۆسا توشم بووە بەس نییە، تۆ ئەمەشی دەهێنیتە سەر؟ فیبۆناتچی کێیە کە باسی دەکەی؟ بەدوایەکداهاتنەکانی چین؟

بەڵکــــو وشـــــەی بەدوایەکـــــداهاتن واتـــــای چیـــــیە؟

نیزال پێکەنی و وتی:

- ببووره عبدالعزیز، لیۆناردۆ فیبۆناتچی ( Leonardo Fibonacci)بەناویانگترین زانای ئیتالی یە لە مێژوودا، بەڵکو بەناویانگترین زانای ئەورووپییە لە سەدەکانی ناوەڕاست، هەروەها یەکێکە لە بەناویانگترین زاناکانی بیرکاری لە مێژوودا، لە ساڵی ١١٧٥ز لە شاری پیزای ئیتاڵی لەدایکبووە، ئەو زانا ئیتاڵییە بوو کە ژمارە عەرەبییەکانی لە ئەورووپا بڵاوکردەوە.

- بەدڵنیاییەوە تۆ مەبەستت لە ژمارە عەرەبییەکان ئەو ژمارانەن کە ئێمە لە مەغریب بەکاریان دەهێنین، کە بەم شێوەیە دەنوسرێت:١ ,٢ ,٣ ,٤ ,٥ نەک ئەو ژمارانەی ئێوە لە ڕۆژهەڵات بەکاریان دەهێنن.

- ڕاستە عبدالعزیز، بەداخەوە زۆربەی عەرەبەکانی ڕۆژهەڵات بەم ژمارانە دەڵێن ژمارەی ئینگلیزی، ئەگەرچی ناوەکەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و تەواوی جیهان بریتییە لە (ژمارە عەرەبییەکان) (Arabic Numerals)، لەبەرئەوەی ئەو زانایانە پەرەیان بەم ژمارانەدا کە سەر بە شارستانییەتی عەرەبی ئیسلامین.

- بەڵام فیبۆناتچی چۆن ئەم ژمارانەی ناسی لە کاتێکدا خۆی ئیتاڵییە؟

- فیبۆناتچی بەشێکی زۆری ژیانی لە نێو مسوڵمانانی وڵاتانی باکوری ئەفریقا بەسەربردووە، باوکی بازرگانێکی گەورەی ئیتاڵی بووە، سەرپەرشتیاری بازاڕەکانی بیزای لە جەزائیر و تونس و

مەغریب دەکرد، لیۆناردۆش لەگەڵ باوکی لەم وڵاتانە گەڕاوە و لەشاری بجایەی جەزائیری خوێندویەتی کە پڕبووە لە زانای بیرکاری گەورەی وەکو عبدالحق ئیشبیلی و ئیبن ئەحمەد و سیدی بومدین و ئەبی حمید الصغیر..هتد

فیبۆناتچی سودێکی زۆری لە مانەوەی لە جەزائیر بینیوە، کە لەو کاتەدا پڕ بووە لە زانای گەورە، کاریگەربوونی ئەم زانایە بە شارستانییەتی ئیسلامی لە میانەی یەکێک لە پەرتووکەکانی دەردەکەوێت، کە هەستا بە بڵاوکردنەوەی لە لای چەپ بۆلای ڕاست، بەمەش فیبۆناتچی سیستەمی ژمێریاری و ژمارەی عەرەبی بە ئەوروپا ئاشناکرد، لە سەرەتادا فیبۆناتچی ڕووبەڕووی هێرشێکی زۆر بوویەوە لەلایەن ئەوانەی ڕەتیان دەکردەوە ئەم سیستەمە بەکاربهێنن، بەڵام بەتێپەڕبەنی کات ئەوروپییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەم ژمارانە زۆر باڵاترن لە ژمارەی بەکارهاتووی ئەوکاتە کە ژمارە ڕۆمانییەکان بوون، تا ئێستاش ژمارە عەرەبییەکان لە ڕۆژئاوا بەکاردێن، هەمان ژمارە لە ژمێرە ئەلیکترۆنییەکانیش بەکاردێت، بەڵام ناوبانگی فیبۆناتچی بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بەدوایەکداهاتنەکانی کە ناسراوە بە (بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی).

- پێش ئەوەی بچیتە ناو قسەکانتەوە نیزال، پێم بڵێ وشەی بەدوایەکداهاتن واتای چییە؟!
- بەدوایەکداهاتن کە پێشی دەوترێت زنجیرەیی یان هاوڕێژەیی، بریتییە لە کۆمەڵێک پێکهاتەی ڕیزکراو بە شێوازێکی

دیاریکراوی واتادار، بەشێوەیەک کە هەرپێکهاتەیەک پەیوەندی بە پێکهاتەکەی دوای خۆی هەیە و بە شێوازێکی دیاریکراو پێیەوە گرێدراوە.

- دەکرێ نموونەیەکم بۆ باسبکەی؟

- بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی نمونەیەکە لەسەر بەدوایەکداهاتنەکان، هەر ژمارەیەک کۆی دوو ژمارەی پێش خۆیەتی، ئەگەر وادابنێین ژمارەی یەکەم (١) بێت، ئەوا ژمارەی دووەمیش هەر دەکاتەوە ١ چونکە کۆی دوو ژمارەی پێش خۆیەتی کە ١ و٠، ژمارەی سێیەمیش لەم زنجیرەیە دەکاتە ٢ چونکە کۆی دوو ژمارەی پێش خۆیەتی کە ١ و ١، هەر بەم شێوەیە بۆتەواوی ژمارەکانی تر، هەر ژمارەیەک دەکاتە کۆی دوو ژمارەی پێش خۆی: ١, ١, ٢, ٣, ٥, ٨, ١٣, ٢١, ٣٤, ٥٥, ٨٩, ١٤٤ بەم شێوەیە ئەم زنجیرەیە بەردەوام دەبێت تاوەکو بێ کۆتا.

The Fibonacci Sequence

1,1,2,3,5,8,13,21,34,55,89,144,233,377...

| | |
|---|---|
| 1+1=2 | 13+21=34 |
| 1+2=3 | 21+34=55 |
| 2+3=5 | 34+55=89 |
| 3+5=8 | 55+89=144 |
| 5+8=13 | 89+144=233 |
| 8+13=21 | 144+233=377 |

- ئێستا تێگەیشتم، بەڵام تا ئێستا تێنەگەیشتووم پەیوەندی ئەم کارە بە هێڵی دواتری نهێنی بەریەرۆسا چییە؟!

- عبدالعزیز، پێموایە کاتی ئەوە هاتووە سەردانی خاڵەکانت بکەیت لە جەزائیر.
- جەزائیر، دەتەوێت لە جەزائیر بگەڕێیت تەنها لەبەرئەوەی زانایەکی ئیتاڵی لەوێ خوێندوویەتی؟ نیزال دەزانی ڕووبەری جەزائیر چەندە؟ جەزائیر گەورەترین وڵاتی ئەفریقیایە لە ڕووی ڕووبەرەوە و دەیەمین وڵاتی جیهانە، چۆن دەتەوێت لەم ڕووبەرە فراوانە بەدوای هێڵی بەربەڕۆسا بگەڕێیت؟!
- لەسەرخۆبە هاوڕێ، لە هەموو خاکی جەزائیر ناگەڕێین، بەڵکو تەنها لە شارێکی دیاریکراو دەگەڕێین، تەنها لەو شارە دەگەڕێین کە لە دەروازەکەی پەیکەرێکی مێژوویی هەیە، کۆمەڵێک نافورەی ئاو دەوری داوە، ئەو پەیکەرە بریتییە لە: کەشتیەکی جەنگی و لە برۆنز دروستکراوە، ئەم پەیکەرە وەکو یادگاریەک خەڵکی ئەو شارە دروستیانکردووە بۆ ئەو دوو سەرکردە ئەوروپییە مسوڵمانەی پێش نزیکەی ٥٠٠ ساڵ، بە کەشتییەکانیان بەڕێکەوتن بۆ بەرگریکردن لەو شارە لە دژی خاچپەرستان، ئەو کەشتییەی کە بینیت عبدالعزیز لەسەر بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی هەمان کەشتییە کە بۆتە هێمای شاری جیجلی جەزائیری، کەشتی برایانی بەربەڕۆسا!

***

# جەزائیر

## پایتەختی بەربەرۆسا

لە نیوەی ڕێگایـان لە جەزائیـری پـایتەختەوە بەرەو شـاری جیجلـی جەزائیـری، نیـزال و عبـدالعزیز لەو شـارە بـۆ پشـوودان وەسـتان کە فیبۆناتچی لێی خوێندبوو، شـاری بجـایەی جەزائیـری، لە یەکێـک لە چێشـتخانەکان دانیشـتن و لە کـاتی نانخواردنەکەیـان خەریکـی گۆڕینەوەی بیروڕابوون.

- عبدالعزیز، ئەو خواردنە بەچێژە چیبوو کە داوات کردبوو؟
- ئەوە بەناوبـانگترین خـواردنە لە شـاری بجایەی جەزائیـری، ناوی (عصبان السـمید) یـان (تیکوربابین)ە، بە لەهـجەی خۆمـاڵی ناوچەکەش پێی دەوترێت (تیعسفانین)، تامەکەی چۆن بوو نیزال؟
- زۆر خۆش و بەتام بوو، ئێمە لە وڵاتـی شـام خواردنێکمـان هەیە زۆر لەوە دەچێـت پێـی دەڵـێن (الكبە)، ئەویـش لە بـرویش دروست دەکرێت، عبدالعزیز تۆ لە زمـانی (ئەمـازیغی) تێدەگەیت کە خەڵکی ئەم ناوچەیە قسەی پێدەکەن؟
- زمـانی ئەمـازیغ کۆمەڵێـک لەهـجەی جیـاواز لەخۆدەگرێـت دەتوانم بە هەموویان قسەبکەم، دایکم ئەمـازیغییەکی جەزائیـرییە لە ناوچەی (قبائل)، هەروەها لە (مەغریب)یش کۆمەڵێک لەهجەی تری ئەمازیغی لێیە ئەوانیش لە هاوڕێکانم فێربووم.
- دایکت ئەمازیغییە، بەڵام باوکت عەرەبە؟

- ڕاسته باوکم عەرەبێکی مەغریبییە، دایکیشم ئەمازیغییەکی جەزائیرییە، داپیرەم لە باوکمەوە (مۆریسکی)یەکی ئەندەلوسی ئەوروپییە، داپیرم لە دایکمەوە ئەفریقییەکی سەنیگالییە.

دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز خواردنەکەیان تەواوکرد، خاوەنی چێشتخانەکە هات و لەگەڵ عبدالعزیز بە زمانی ئەمازیغی چەند قسەیەکی کرد کە نیزال لێی تێنەگەیشت، دوای ئەوە هەردوکیان کەوتنە هاوارکردن لەسەر یەکتری، لە کاتێکدا نیزال بەسەرسوورمانەوە سەیری دەکردن، خاوەنی چێشتخانەکە ڕووی کردە نیزال و بەزەردەخەنەوە سڵاوی لێکرد، نیزالیش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە.

- عبدالعزیز باسی چیتان دەکرد، بۆچی هاوارتان دەکرد لەسەر یەکتری؟

- هاوارمان نەدەکرد لەسەر یەکتری، بەڵکو بەشێوەیەکی ئاسایی قسەمان دەکرد، سەرەتا پرسیاری کرد ئایە خواردنەکەمان بەدڵبوو؟ پێم وت زۆرمان بەدڵبووە، پاشان پرسیاری لێکردم خەڵکی کوێین؟ پێم وت: من خەڵکی مەغریبم، بۆیە بەوە زۆر خۆشحاڵ بوو، پێی وتم: لە کۆنەوە جەزائیری و مەغریبییەکان بران و خێزانەکەی مەغریبییە و خەڵکی شاری ئەکادیری باشوری مەغریبە، پاشان دەربارەی تۆ پرسیاری کرد، منیش پێم وت: تۆ خەڵکی غەزەی فەڵەستینی، دوای ئەوەی تۆم پێناساند سور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەم خواردنە دەعوەتی ئەو بین، منیش بەداوای لێبوردنەوە سوپاسم کرد، بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوە، دووبارە سوپاسی

بەخشندەیم کرد و جارێکی تر داوای لێبوردنم لێکرد و ویستم حیسابەکەم بدەم، بۆیە زۆر تورەبوو، سوور بوو لەسەرئەوەی کە هیچ پارەیەک نەدەین.

- دەزانی عبدالعزیز، دەمەویست لە شوفێری تاکسییەکەمان بشارمەوە کە من فەڵەستینیم، هەست بەشەرمەزاری دەکەم لە بەرامبەر باشی ئەو گەلە چونکە تەنها بەوەی بزانن فەڵەستینیم کرێکەیان وەرناگرن و لە خۆشەویستی قودس و فەڵەستین دەست دەکەن بە گریان.

- ئەمە تەنیا تایبەت نییە بە جەزائیر نیزال، زۆرێک لە هاورێکانم لە مەغریب داوام لێ دەکەن کە پێت بڵێم مشتێک خۆڵی فەڵەستینیان بۆ بهێنی، کێشەی فەڵەستین و قودس تەنها کێشەی ئێوە نییە هاورێ، بەڵکو ئەوە کێشەی هەموانە و سەرەڕای هەموو جیاوازییەکانمان بابەتی قودس هێڵی سوورە لای هەموو تاکێکی مسوڵمان، لەوانەیە بیروڕای سیاسیمان جیاوازبێت، یاخود ئاراستەی فیکریمان جیاوازبێت، بەڵام کێشەی فەڵەستین کۆمان دەکاتەوە.

دوای نانخواردنەکەیان، دوو هاورێکە چونەلای خاوەن چێشتخانەکە و بە گەرمی ماڵئاوایان لێکرد، پاشان بەو ئۆتۆمبێلەی خاڵی عبدالعزیز وەری گرتبوەوە بەرەو رۆژهەلاتی شاری بجایە بەرێکەوتن، واتە بەرەو شاری جیجلی جەزائیری.

- عبدالعزیز دەزانی دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵناسی و خاوەن کتێبی بەناوبانگی (المقدمة)، زانای گەورەی ئیسلامی (ابن خلدون) ماوەیەک لە شاری بجایەی جەزائیری ژیانی بەسەربردووە،

دوای ئەوەی لە شاری ئەلمێریای ئەندەلوسی ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو شارە هاتووە.

- عبدالعزیز گوتی: پێش ئەوەی ئەوە بزانم دەمەوێت بزانم پەیوەندی جەزائیر بە هێماکانی سەر ئاڵای بەربەڕۆساوە چییە؟

- مەبەستت چییە عبدالعزیز؟

- وێستگەی یەکەمی نهێنی بەربەرۆسا شاری ئیستەمبۆڵی تورکیا بوو کە برگەی (وبشر المؤمنین یا محمد) دەکەوتە لای سەرەوەی نهێنی بەربەڕۆسا، ئاماژەی بۆ دەکرد، هەروەها شمشێری دووسەر هێمابوو بۆ وێستگەی دووەممان کە شارە فەرەنسیەکە بوو، بەڵام چی جەزائیر دەبەستێتەوە بە نهێنی بەربەڕۆسا؟

- دوو هێمای گەورە هەن کە جەزائیر بە نهێنی بەربەرۆسا دەبەستێتەوە، یەکەمیان واتای خودی جەزائیرە بۆ بەربەڕۆساو واتای بەربەڕۆسایە بۆ جەزائیر، مێژووی هەریەکەیان پەیوەستە بەویتریانەوە، ئەم سەرکردە گەورە مسوڵمانە بە درێژایی مێژوو بە یەکێک لە گەورەترین هێماکانی جەزائیر دادەنرێت، تەنانەت هەندێک کەس بەربەڕۆسا بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی دەوڵەتی جەزائیر دادەنێن، بەربەڕۆسا پێش ئەوەی ببێتە فەرماندەی گشتی هێزی دەریایی ئیسلامی والی جەزائیر بوو، لەسەردەمی عوسمانییەکان وا باوبوو هەرکەسێک ببێتە والی جەزائیر پاشان دەبێتە بەهێزترین پاڵێوراو بۆ فەرماندەیی هێزی دەریایی عوسمانی، جەزائیریەکان تا ئەمڕۆش ڕێزێکی زۆر لە بەربەڕۆسا دەگرن، چونکە بەربەڕۆسا لە داگیرکەرانی سەرەتای سەدەی شازدەی زایینی ڕزگاری کردن، هەر

ئەمیش بوو جەزائیری کردە بنکەیەکی دەریایی گەورە بۆ بەرپەرچدانەوەی چەتەکانی (قدیس یوحەنا) و کەشتیگەلی ئیسپانی و هاوپەیمانە خاچپەرستەکانیان، هەر ئەمیش دەورێکی گەورەی هەبوو لەوەی جەزائیر ببێتە ولایەتێکی عوسمانی و لەنێو هەموو ولایەتەکان بارێکی تایبەتی هەبێت، لەسەردەمی عوسمانییەکان جەزائیر بووە پایتەختی ناوەندی بۆ هەرسێ ولایەتەکانی باکوری ئەفریقیایی عوسمانی (لیبیا، تونس، جەزائیر)، هەرسێ ولایەتەکانیش لەژێر سەرپەرشتی گشتی (خیرالدین بەربەڕۆسا) بوون کە جەزائیری کردبووە مەڵبەندی خۆی و بنکەی هێزی دەریایی ئیسلامی عوسمانی لە دەریای سپی ناوەڕاست. لەسەردەمی بەربەڕۆسا و جێنشینەکانی، جەزائیر بۆ گەورەترین بنکەی هێزی دەریایی لە دەریای سپی ناوەڕاست لەو سەردەمە گۆڕا، بە شێوەیەک هەر کەشتییەکی بیانی بەو دەریایەدا تێپەڕیبا باجی دەدا بە والی دەوڵەتی عوسمانی لە جەزائیر، تاوەکو لە ژێر پارێزبەندی کەشتیگەلی عوسمانیدا بێت کە بەردەوام هێرشی دەکردە سەر چەتەکانی دەریا، بەتایبەت چەتەکانی قدیس یوحەنا.

- هێمای دووەم لە نهێنی بەربەڕۆسا چییە کە ئاماژە دەکات بۆ جەزائیر؟
- هێمای دووەم بریتییە لە لەپی دەست لە ئاڵای بەربەڕۆسا لە تەنیشت دەسکی شمشێرەکە.
- پەیوەندی جەزائیر بە لەپی دەست چییە؟

- پـــاڵەوانی گەورەی جەزائیـــری و ســـەرکردەی بەرگـــری جەزائیری دژی داگیرکەری فەرەنسی (امیر عبدالقادر بن محيي الدين) ناسراو بە ئەمیر عبدالقادری جەزائیری، ئاڵاکەی پێکهاتبوو لە دوو هێڵی سەوز ناوەندەکەی هێڵێکی سپی بوو، لە ناوەڕاستەکەی هێمای لەپێکی دەست بوو، لەوانەیە لەپی دەستی بۆ ئاڵاکەی هەڵبژاردبێت چونکە بنچینەی دەگەڕێتەوە سەر ئیدریسییەکان، ئەوانیش لە ئالی بەیتن، لەپی دەستیش لە ئاڵاکەی بەربەڕۆسا وەکو پێشتر پێم وتی هێماشە بۆ ئالی بەیت.

- ئـایە ئەو قسـەیە ڕاسـتە کە لەم دوایـانەدا بڵاوکـراوەتەوە بەوەی کە ئەمیر عبدالقادر ماسۆنی بووە؟

- بەدڵنیایەوە نەخێر، ئەم جـۆرە هەواڵانە تەنها هەوڵـێکە بۆ ناشرینکردن و شێواندنی مێـژووی ئەم پـاڵەوانە گەورەیەی ئیسلام و ناشرینکردنی مێژوی جەزائیر و پاڵەوانەکانی، ئەم پیـاوە یەکێکە لە گەورەتـــرین پـــاڵەوانە مســـوڵمانەکان بە درێژایـــی مێـــژوو، ئەگەر مەبەستیشت ئەو وێنەیە کە هەندێک کەس بڵاوی دەکەنەوە وا وێنای دەکەن لەسەر جلوبەرگەکەی کۆمەڵەک هێمـای وەکـو خـاچ هەیە، لە ڕاستیدا ئەم هێمایانە کۆمەڵێک ڕێزلێنانن کە پاشاکانی ئەوروپا وەکو ڕێزلێنان لە پایەی چاکەکانی پێیان بەخشیوە، لەمیانەی ئەو کێشەی لە نێوان مەسیحی و درووزەکان دروست بـوو، هەسـتا بە ڕزگـارکردنی مەسـیحییەکان، ئەمیـر عبـدالقادر لە مـاڵەکەی خـۆی پێشـوازی لە مەسیحییەکان کرد لە پێناو پاراستنیان، بەم کارەشـی تەنهـا ئەوەی جێبەجێکردوە کە شەریعەتی ئیسلامی داوای لێ کردوە بە پاراستنی

ستەم لێ کرا و مافخوراوەکان، تەنانەت ئەگەر مسوڵمانیش نەبن، کاتێک پاشاکانی ئەورووپا بەم کارەیان زانی، هێمای نیشتمانیان پێدا وەکو رێزێک بۆ ئەم کارە مرۆڤدۆستانەیەی، وەکو دەشزانی زۆربەی ئەم هێمایانەش لەسەر شێوەی خاچن، دواتر وێنەیەکی گرت کە هەموو هێماکانی بەخۆیەوە هەڵواسی بوو، هەروەها هێمای مانگی تورکی کە خەلیفەی عوسمانی پێیدابوو لەسەر هەموو هێماکان هەڵواسی بوو.

لەناکاو... نیزال لە قسەکردن وەستا، دوای ئەوەی دوکانێکی بچوکی لەسەر رێگا گشتییەکە بینی، بۆیە داوای لە عبدالعزیز کرد ئۆتۆمبێلەکە بوەستێنێت تاوەکو بچێت هەندێک پێداویستی بکرێت بۆ تەواوکردنی رێگاکەیان، دوای چەند خولەکێک نیزال گەڕایەوە بەدەستێکی کیسێکی پڕ لە خواردنەوە ساردەکانی هەڵگرتبوو، بەدەستەکەی تریشی تۆپێکی بچوکی پێی هەڵگرتبوو.

- ئەم تۆپە چییە نیزال؟ پێتوایە کاتی ئەوەمان دەبێت یاری تۆپی پێ بکەین؟

نیزال پێکەنی، پاشان وەڵامی دایەوە:

- بۆچی نا هاورێ؟ نابێت کاروبارەکانی ژیان لە وەرزش بێ ئاگات بکەن!

***

# له مەیدانی بابا عەروج



نزیکەی نیوەشەو بوو بە کاتی جەزائیر، مەیدانی بابا عەروج لە شاری جیجلی جەزائیری نیمچە خالّی بوو لە خەڵکی، ئەوکاتەی نیزال و عبدالعزیز لەبەردەم پەیکەری کەشتی بەربەرۆسا یاری تۆپی پێیان دەکرد بەو تۆپەی نیزال لەڕێگایان بەرەو جیجل کڕی. عبدالعزیز ئەو کاتەی تۆپەکەی بۆ نیزال هەڵدەدا گوتی:

- پێتوانیە خەڵکی بەشێتمان دەزانن بەم کاتە بەم تۆپە هەواییە یاری دەکەین کە بەزۆری منداڵان یاری پێدەکەن؟
- هاوڕێ، ڕوحی وەرزشیت هەبێت، تۆپ هەر تۆپە، شێوەکەی هەرچۆنێک بێت، تۆ ئێستا لە جەزائیریت، خەڵکی ئەم وڵاتە زۆر حەزیان لە تۆپی پێیە، بۆیە لایان نائاسایی نیە ببینن دوو گەنج لە نیوەشەو تۆپی پێ دەکەن، بەم بۆنەیەوە عبدالعزیز، ئایە دەزانی جەزائیر بوە هۆی گۆڕانی یاساکانی تۆپی پێ لە جیهان؟
- بە چ شێوەیەک؟

- له جامی جیهانی تۆپی پێ له ئیسپانیا ساڵی ١٩٨٢ز، هەڵبژاردەی جەزائیر توانی له یاری یەکەم له هەڵبژاردەی ئەڵمانیای خۆرئاوا بباتەوە کە پاڵێوراوێکی بەهێز بوو بۆ بردنەوەی نازناوەکە، له یاری دووەم هەڵبژاردەی جەزائیر بەرانبەر نەمسا دۆڕا، بەڵام له یاری سێیەم له هەڵبژاردەی شیلی بردەوە، بەمەش هەڵبژاردەی جەزائیر زۆر له سەرکەوتن بۆ قۆناغی دواتر نزیک بوو، تاکە ئەنجام وای دەکرد جەزائیر سەرنەکەوێت بۆ قۆناغی دواتر بردنەوەی ئەڵمانیا بوو له یاری سێیەم له نەمسا بە جیاوازی گۆڵێک، بەمەش هەردوو هەڵبژاردەی ئەڵمانیا و نەمسا سەردەکەوتن، هەر ئەمەش رویدا، دوای رۆژێک له یاری سێیەمی هەڵبژاردەی جەزائیر، هەڵبژاردەی ئەڵمانیا و نەمسا یاری سێیەمیان کرد کە تیایدا ئەڵمانەکان هەر زوو گۆلێکیان تۆمارکرد و بەم شێوەیە بەردەوام بوون له بەرێکردنی یاریەکی گاڵتەجارانە بۆ مانەوەی ئەنجامەکە بەم شێوەیە، ئەم یاریەش بە یەکێک له ئابڕوچونەکانی مێژووی تۆپی پێ دادەنرێت، بەمەش هەردوو هەڵبژاردە جەرمانیەکە سەرکەوتن و جەزائیر له قۆناغی یەکەم کرایە دەرەوە، لەم کاتەوە یەکێتی تۆپی پێی جیهانی ناسراو بە (فیفا) یاساکانی جامی جیهانی گۆڕی، بەشێوەیەک کە یاری کۆتایی هەڵبژاردەکانی هەمان گروپ له هەمان کات بەڕێوەبچن، بۆ رێگریکردن له یاری کردن بە ئەنجامەکان.

- جێی داخە! پێشتر پێم وابوو تۆپی پێ بۆ بڵاوکردنەوەی رۆحی وەرزشی بانگەواز دەکات لەنێو خەڵکی، بەڵام ئەوەی دەیبینم له پلانگێران و تێکدانی ناو یاریگاکان و دروشمە رەگەزپەرستیەکان

لەلایەن ماندەرانەوە وێنەی تۆپی پێی ناشرینکردوە کە لە منالّیەوە خۆشمان ویستوە، بەڵام ئەوەی ئەم یاریەمان لا شیرین دەکات بوونی کۆمەڵێک یاریزانی ڕەوشت بەرزە، کە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆحی خۆشەویستی لە نێو گەلان بەشداری دەکەن، نیزال چیرۆکی کەشتی برایانی بەربەڕۆسا چیە کە ئێستا لەپاڵی یاری دەکەین؟

- لە کۆتایی سەدەی پازدە و سەرەتای سەدەی شازدە، جەزائیر و وڵاتانی باکوری ئەفریقیا بونە ئامانجی خاچپەرستە داگیرکەرەکان کە ئامانجیان نەهێشتنی ئیسلام بوو لە باکوری ئەفریقیا، بۆیە زۆرێک لە شارەکانی مەغریب و جەزائیر و تونس و لیبیا داگیرکران، ئەم هێرشانە بە بەشداری کەشتیگەلی ئیسپانی و پورتوگالی و چەتەکانی قدیس یوحەنا بەڕێوەدەچوو، لەژێر چاودێری و پیرۆزکردنی ڕاستەوخۆی پاپای ڤاتیکانەوە، لە ساڵی ١٥٠٤ز کەشتیگەلی ئیسپانی بەسەرکردایەتی قەشەی کاسۆلیکی (فرانسیسکۆ خیمینیس دی سیسنیروس) بەرەو جەزائیر بەڕێکەوت بۆ داگیرکردنی، ئەم قەشەیە پیاوێکی توندڕەو بوو کە پێشتر کرابویە گەورەی پشکنەران لە (دادگاکانی پشکنینی کاسۆلیکی) کە بەرپرسیار بوون لە سزادانی مسوڵمانان و جولەکەکان لە ئەندەلوس (ئیسپانیا و پورتوگالی ئێستا)، لەهەمان ساڵ ئیسپانیەکان توانیان شاری وەهرانی جەزائیری داگیربکەن، دوای ئەوە شاری مێرسی گەورەیان داگیرکرد، دواتر شارەکانی بجایەو عەنابە و زۆربەی شارەکانی تری جەزائیری کەوتنە دەست خاچپەرستە داگیرکەرەکان، کە بۆ گۆڕینی ئاینی خەڵکی جەزائیر

هاتبون، شاری جیجلی جەزائیری کەوتبوە پشکی داگیرکەرانی کۆماری جێنەوای ئیتاڵی، بۆیە خەڵکەکەی هانایان بۆ هەردوو برا عەروج و بەربەرۆسا برد کە ناوبانگیان لەو کاتەدا بەهۆی کارە پاڵەوانەکانیان لە ڕزگارکردنی خەڵکی بێتاوانی ئەندەلوس لە مسوڵمان و جولەکەکان لەدەست دادگاکانی پشکنین بڵاوببویەوە، هەروەها بەهۆی سەرکەوتنە دەریایە مەزنەکانیان بەسەر چەتاکانی قدیس یوحەنا، بۆیە دوو براکە بۆ ڕزگارکردنی شاری جیجلی جەزائیری و تەواوی شارەکانی تری جەزائیر و باکوری ئەفریقیا بەرێکەوتن، بۆیە وەکو ڕێزێک بۆ عەروجی پاڵەوان و برا بچوکەکەی خیرالدین خەڵکی ئەم شارە ئەم کەشتیە برۆنزیەیان دروست کردوە، کە لە کەشتی برایانی بەربەرۆسا دەچێت کە ئەم شارەیان ئازادکرد، هەروەها ئەم مەیدانەیان ناوناوە مەیدانی بابا عەروج واتە عەروج بەربەرۆسا .

- نیزال پێشتر زۆرباسی سەرکردە خیرالدین بەربەرۆسات بۆکردوم، بەڵام زۆر باسی برا گەورەکەی عەروج یان بابا عەروجت بۆ نەکردوم؟

- عەروج برا گەورەی خیرالدین بەربەرۆسا بوو، ئەم سەرکردە ئەلبانیە گەورەیە لەو شەوەدا لەدایک بوو کە بەشێک لە مسوڵمانان پێیان وایە شەوی ئیسراو میعراجە، بۆیە باوکی ناوینا ( عُرّوج)، کە پێشی دەوترێت (ئوروج)، کاتێک ئەم سەرکردە ئەلبانیە گەورەیە هەستا بە ڕزگارکردنی هەزاران ئەندەلوسی لە دادگاکانی پشکنین، خەڵکی ئەندەلوس ناویان لێنا (بابا ئەروس) کە بەزمانی خەڵکی

ئەندەلوس واتە (باوکە عروج)، وەکو ڕێز و سوپاسێک بۆ ئەو سەرکردەیەی کە ژیانی خۆی خستە مەترسیەوە بۆ ڕزگارکردنیان، ئەورووپیەکانیش ناوەکەیان دەستکاری کردو کردیانە (باربارۆس) واتە خاوەن ڕیشی سوور، پاشان ئەم نازناوە گوازرایەوە بۆ خیرالدینی براشی، بۆیە ئەم دوو برایە لە کەنارەوەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بە (برایانی بەربەڕۆسا)بەناوبانگ بوون.

- کەواتە بنچینەی وشەی (باربەڕۆسا) یان (باربرۆس) دەگەڕێتەوە بۆ عروج، ئایە بەڕاست عروج چەتە بوو وەکو چۆن لە ڕاگەیاندن وا پیشان دەدرێت؟

- بەپێچەوانەوە عبدالعزیز، عروج دوژمنی سەرسەختی چەتەکان بوو، ئەم سەرکردە ئەورووپیە مسوڵمانە گەورەترین و خانەدانترین سەرکردەی دەریایی بووە، نەک تەنها لە مێژووی مسوڵمانان، بەڵکو لە تێکڕای مێژوودا، بە کەشتیگەلەکەی لەگەڵ خیرالدینی برای و براکانی دیکەی سەدان بێتاوانی مسوڵمان و جولەکەی لە دادگاکانی پشکنین ڕزگارکرد، ئەمەش لەڕێگای چەندین کردەی سەربازی دەریایی نیمچە مەحاڵ، ئەم سەرکردەیە بەڕەوانی بە زمانەکانی تورکی و ئەلبانی و عەرەبی و ئیسپانی و یۆنانی و فەڕەنسی قسەی دەکرد، ژیانی زیاتر لە ئەفسانەکان دەچێت کە باوەڕکردنی زەحمەتە، تەنها ئەوە بەسە بزانی کاتێک بەند بووە لای چەتەکانی قدیس یوحەنا.

- نیزال چیرۆکی بەندکردنی لەلایەن چەتەکانی قدیس یوحەناوە چییە؟

لەسەرەتای ژیانیدا، عروج بازرگانی لە نێوان بەندەرەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا دەکرد، لە میانەی گەڕانەوەی لە یەکێک لە گەشتە بازرگانیەکانیدا لە شاری تەڕابلوسی لوبنانیدا، توشی چەتەکانی قدیس یۆحەنا دەبێت و چەتەکان دەتوانن دەست بەسەر کەشتیەکەیدا بگرن و ئیلیاسی برای بکوژن و عروج بە برینداری دەکەوێتە دەست چەتەکان، چەتەکان عروج دەبەنە زیندانێکی تاریک لەژێر زەوی، لە قەڵای (سانت بییر)ی ناسراو بە قەڵای (بودروم) لە دورگەی ڕۆدسی بنکەی چەتەکانی قدیس یۆحەنا، عروج لەم زیندانەدا چەندان ساڵ مایەوە و ئازاردەدرا، لە کاتێکدا خیرالدینی برای لە هەموو شوێنێکدا بەدوایدا دەگەڕا، تاوەکو یەکێک لە بازرگانە مەسیحیەکان شوێنی زیندانی براکەی پێگوت، خیرالدین هەوڵیدا دزە بکاتە ناو قەڵاکە تا براکەی ئازاد بکات، بەڵام کارەکەی ئاشکرابوو، دواتر پێشنیاری کرد برە پارەیەکی زۆر بە چەتەکان بدات لە جیاتی براکەی، بەڵام چەتەکان ڕقێکی زۆریان لە عروج بوو بۆیە ئەو برە زۆرە پارەییان ڕەتکردەوە، هەروەها چەتەکان پێشنیاری ئەمیری عوسمانی (کرکود) کوڕی سوڵتانی عوسمانی بایەزیدی دووەمیان ڕەتکردەوە بە ئازادکردنی دیلەکانی ئەوان بەرانبەر ئازادکردنی عروج، دوای ساڵانێک لە ئازاردان چەتەکان بڕیاریاندا عروج لە زیندانە تاریکەکەی دەربهێنن و بە یەکێک لە کەشتیەکان بیبەستنەوە تاوەکو وەکو کەشتیەوان کاربکات، لە یەکێک لە شەوەکان و لەو کاتەی کەشتی چەتەکان لە نزیک یەکێک لە کەناری شارە تورکیەکان بوو، بای پێچەوانە هەڵیکرد بۆیە چەتەکان بڕیاریاندا چاوەڕوانی بەیانی

بکەن، پاشان بەلەمێکی بچوکیان دەرهێناو چون بۆ ڕاوکردن، لەم کاتەشدا بایەکی بەهێز هەڵی کردو بەلەمە بچوکەکە نەیتوانی بگەڕێتەوە ناو کەشتیەکە، عروج ئەم هەلەی قۆستەوە و پەتەکانی کردەوە و خۆی هەڵدایە ناو دەریاو بەمەلەکردن خۆی گەیاندە کەناری دەریا، پاشان دەستی بە گەڕانکرد تاوەکو گوندێکی تورکی دۆزیەوەو ئافرەتێکی بەتەمەن میوانداریکرد، دە ڕۆژ لەلای ئەم پیرەژنە مایەوە و ئەم ئافرەتەش برینەکانی تیمار دەکرد، کە بەهۆی ئازاردانەوە توشی بوبوو، پاشان ماڵئاوایی لەم ئافرەتە باشە کرد و سواری یەکێک لە کەشتیەکان بوو، تا بیگوازنەوە بۆ شوێنێکی ئارام و دوور لە چاوی چەتەکان، چەتەکان کاتێک بەڕاکردنی ئەم بەندیە بریندارەیان زانی زۆر تورەبوون، دوای ئەوە عروج وانەیەکی پێدان کە هەرگیز لەبیری نەکەن!

عبدالعزیز پرسی: عروج چیکرد دوای ئەوەی لە بەندی ئەم چەتانە خۆی ڕزگارکرد؟

- عروج بە یارمەتی خیرالدین و ئیسحاقی برای توانی کەشتیگەلێکی دەریایی بچوک دروست بکات و دەیان وانە بە کەشتیگەلی دوژمن بدات لە دەریای سپی ناوەڕاست لە هونەری جەنگی دەریایی، بەشێوەیەک ناوی (بەربەڕۆسا) بۆ کەشتیگەلی چەتەکان لەڕۆژئاوای دەریای سپی بوە ناوێکی تۆقێنەر، سەرەڕای لەدەستدانی دەستێکی لە یەکێک لە جەنگە دەریایەکان لەگەڵ داگیرکەران، عروج لە بەرگریکردن لە لاوازان و ڕزگارکردنی بێتاوانانی

ئەندەلوس لە مسولمان و جوەکان بەرەو خاکی جەزائیر بەردەوام بوو، ئەم سەرکردە ئەورووپیە لە باکوری ئەفریقیا ناویانگی بڵاوبوویەوە، خەڵکی شارە جەزائیریەکان یەک یەک نامەی بەهانەوەچونیان بۆ سەرکردە عروج بەربەڕۆسا دەنارد تاوەکو لە داگیرکاری ئیسپانی ڕزگاریان بکات، برایانی بەربەڕۆسا لەم شار بەرەو ئەو شار دەچوون بۆ ڕزگارکردنی لەدەست داگیرکەرە خاچپەرستەکان و نۆکەرەکانیان، شاری جیجلیان ئازادکرد، پاشان بەرەو جەزائیر جوڵەیان کرد وئازادیان کرد، دوای ئەوەی برایانی بەربەڕۆسا هێزی ئیمپراتۆری ئیسپانی بەسەرکردایەتی (دیگۆ دوفێرا)یان لەناوبرد، لەگەڵ هێزەکانی شوێنکەوتوە خیانەتکارەکەی ئەمیری حیفصی ( محمد المتوكل)، دوای ئەوە برایانی بەربەڕۆسا شاری جەزائیریان قایم کردو و کردیانە بنکەی دەرچونی هێزەکانیان بۆ ئازادکردنی شارەکانی باکوری ئەفریقیا، لەم سەردەمەدا ئەم شارە گەشەی کرد، دوای ئەوەی هەزاران پەنابەری ئەندەلوسی مسوڵمان و جوو کە عروج ڕزگاری کردبوون تیایدا نیشتەجێبوون، پاشان لە ساڵی ١٥١٨ز دوو براکە لەیەکتری دابڕان و هەریەکەیان چونە بەرەیەکی جەنگی جیاواز، بۆیە عروج لەسەر داوای بەهاناوەچونی خەڵکەکەیەوە ڕویکردە شاری تەلمەسانی جەزائیری، لەم کاتەدا هەندێک لە ناپاکەکان پەیوەندیان بە ئیسپانەکانەوە کرد تاوەکو بۆسەی بۆ بنێنەوە و هێزەکانی ئیسپان توانیان لە هەموو لایەکەوە دەوری ئەم سەرکردە مەزنە بدەن و داوایان لێکرد خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵام عروج ڕەتیکردەوە، بۆیە ئیسپانەکان ویستیان ئیسحاقی

برای لێجیابکەنەوە کە لە پاڵی دەجەنگا و دەستێکی لە یەکێک لە جەنگەکان لەدەست دابوو، عروج و کەتیبە خۆبەخشەکەی توانیان گورزێکی کاریگەر لە ئیسپانەکان بدەن، بەڵام ژمارەی ئیسپانەکان و ناپاکەکانی یەکجار زۆر بوون، بۆیە لە کۆتایدا ئیسپانەکان توانیان عروج و ئیسحاق و ئەو کەسانەی لەگەڵیان بوون شەهید بکەن، عروج لەسەر زەوی تەلمەسانی جەزائیری شەهید بوو، کە تا دوا دڵۆپ لەپێناوی تێکۆشا، ئیسپانەکان سەری عەروجی سەرکردەیان بڕی و گواستیانەوە بۆ ئیسپانیا و بە شارە کاسۆلیکیەکانی ئیسپانیادا دەیانگێڕا و بەهەر شارێک تێپەڕیبوایە زەنگی کەنیسەکان لێیدەدا لە خۆشی لەناوبردنی ئەو سەرەی کە سەرئێشەیەکی زۆری بۆ پاشاو چەتەکانیان دروست کردبوو.

- خیرالدین بەربەڕۆسا چیکرد دوای ئەوەی زانی عروجی برای شەهید بووە؟

- ساتی کۆچی عروجی سەرکردە، خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی خیرالدین بەربەڕۆسا، خیرالدین ئاڵای بەرگریکردن لە مسوڵمانانی لە براکەی وەرگرت، دوای ئەوەی خەڵکی جەزائیر بە جێنشینی براکەی دیاریانکرد، خیرالدین دەیان وانەی هونەرەکانی جەنگی فێری داگیرکەران کرد، دوای ئەوەی پاپای ڤاتیکان (پۆلسی سێیەم) گوێبیستی سەرکەوتنەکانی ئەم سەرکردەیە بوو، چەکدارکردنی گشتی لە هەموو ناوچە کاسۆلیک نشینەکان ڕاگەیاند لە ساڵی ١٥٣٨ز و بەمەش هاوپەیمانیەتێکی گەورەی مەسیحی دروست بوو کە پێکهاتبوو لە (ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا، کۆماری

جێنەوا، کۆماری بوندوقیە، ئیمپراتۆریەتی پرتوگال، چەتەکانی قدیس یۆحەنا، دۆقی مانتۆڤا)، گەورەترین کەشتیگەلی مەسیحی لەوکاتەدا کۆبوەوە کە تا ئەوکاتە زەوی کەشتیگەلی وای بەخۆیەوە نەبینیبوو، کە پێکهاتبوو لە ٦٠٠ کەشتی، کە ٦٠ هەزار سەربازیان هەڵگرتبوو، سەرکردەی گەورەی دەریایی ئیسپانی (ئەندریا دۆریا) (Andrea Doria)، گەورەترین سەرکردەی دەریایی کە تا ئەوکاتە ئەورووپای کاسۆلیکی بەخۆیەوە بینیبوی بۆ سەرکردایەتی ئەم کەشتیگەلە هەڵبژێردرا، ئامانجی خاچپەرستان لەناوبردنی یەکجارەکی هێزی دەریایی ئیسلامی بوو، لە لایەنی خۆشیەوە سوڵتانی عوسمانی، سوڵتان سولێمانی قانونی سەرکردەی گشتی دەریایی ئیسلامی خیرالدین بەربەڕۆسای بە بەرپەرچدانەوەی ئەم کەشتیگەلە زەبەلاحەی خاچپەرستان ڕاسپارد، هێزی دەریایی ئیسلامی پێکهاتبوو لە ٢٢ هەزار سەرباز کە دابەشببون بەسەر ١٢٢ کەشتی، هەردوو هێزی کەشتیگەلی ئیسلامی و خاچپەرستان لە جەنگێکی چارەنوساز لە دەریای سپی ناوەڕاست ڕوبەڕوبونەوە، ئەمەش لە بەرواری ٤ی جمادی یەکەمی ساڵی ٩٤٥ی کۆچی بەرانبەر ٢٨ی ٩ی ١٥٣٨ز، مێژووی گەورەترین جەنگی دەریایی ئیسلامی لە تێکڕای مێژودا بەناوی (جەنگی دەریایی بروزە) (Battle Of Preveza)!

عبدالعزیز پرسی: ڕوداوەکانی ئەم جەنگە دەریای یە گەورەیە چین؟

خیرالدین بەربەڕۆسا دەیزانی هێزی خاچپەرستان زۆر لەوان
زیاترە لە ژمارەی سەرباز و پێداویستیەکانەوە، بۆیە بیری لە
پلانێکی بەهێز کردەوە، بەپێی پلانەکە خیرالدین هێزەکانی لەسەر
شێوەی پیتی (Y) دابەشکرد ئەمەش هەلی بۆ ڕاونانی هێزی دوژمن
بە تۆپی عوسمانی و ڕووبەڕووبونەوەیان بە باڵەکانی هێزی ئیسلامی
دەڕەخساند، خیرالدین سەرکردایەتی باڵەکانی هێزی دەریایی
عوسمانی بە باشترین سەرکردەکانی هێزەکەی دا و خۆشی
سەرکردایەتی دڵی سوپاکەی دەکرد.




1- فرسان المالطية
2- جيوفاني أندريا دوريا
3- فيروني شانزاغ
4- أندريا دوريا
5- ماركو جرميني, فيكنزوكابيللو
6- اليساندرو كوندالميرو، فراسيسكو دوريا

---

1- سيدي علي الرئيس
2- خير الدين بربروس
حسن الرئيس، سنان الرئيس
جعفر الرئيس، سابان الرئيس
3- صالح الرئيس
4- طورغوط الرئيس

هەر بەم بۆنەیەوە عبدالعزیز، سەرکردەی دەریایی (سینان ڕەیس) کە لە بنەڕەتدا جوو بوو یەکێک بوو لە سەرکردە گەورەکان، کە لەپاڵ خیرالدین بەربەڕۆسا لەم جەنگە چارەنوسازە دەجەنگا.

- چی؟! سەرکردەیەکی لە بنەچە جوو لە سوپای بەربەڕۆسا؟!

- توشی سەرسوڕمان مەبە هاوڕێ، زۆرێک لەو جوانەی کە مسوڵمانان لە ئەندەلوس ڕزگاریان کردبون لەپاڵ مسوڵمانان دژی هێزە کاسۆلیکەکان دەجەنگان، کە جۆرەها سزایان دابوون لە دادگاکانی پشکنین، سینان ڕەیس لە ئیسپانیا لە لە خێزانێکی جوەکانی سەفەردیم لەدایکبووە، خێزانی ئەم سەرکردەیە پەنایان هێنابوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی بۆ ڕزگاربوون لەدەست دادگاکانی پشکنین، دوای ئەوە بووە یەکێک لە گەورەترین سەرکردەکانی کەشتیگەلی دەریایی ئیسلامی عوسمانی، سەنان ڕەیس لای ئەورووپیەکان بە نازناوی (جولەکەی گەورە)( The Great Jew)ناسرابوو، ئەم نازناوەی لەلایەن حاکمی پرتوگالی لە هیند لێنرا، ئەوکاتەی بیستی سوڵتان سلێمانی قانونی ڕایسپاردوە بە ئامادەکردنی کەشتیگەلی عوسمانی لە دەریای سور بۆ بەهاناوەچونی مسوڵمانانی هیند، بەربەڕۆسا ڕێزێکی زۆری لە سینان ڕەیس دەگرت، بەشێوەیەک هەڵیبژارد لەنێو ئەو سەرکردانەی کە لەپاڵی بجەنگن لە دڵی سوپادا لە جەنگی بڕۆزەی چارەنوساز، بەڵکو دوو ساڵ دوای

ئەوە بەربەڕۆسا خۆی سەرکردایەتی کەشتیگەلێکی عوسمانی کرد بۆ کەناراوەکانی ئیتاڵیا بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەی سینان ڕەیس کە لەلایەن یەکێک لە فەرمانڕەوا کاسۆلیکەکان بەدیل گیرابوو و بەربەڕۆسا بەدەستی خۆی کوڕەکەی سینان ڕەیسی لە دیلی ڕزگارکرد.

- ئەنجامی جەنگی برۆزەی دەریایی چی بوو؟

- پێش ئەوەی ئەندریا دۆریا لەم پێکهاتە سەیرە داهێنەرانەی بەربەڕۆسا سەردەربکات، سەرکردە خاچپەرستەکان لەناکاو بینیان هێزی دەریایی ئیسلامی تۆپبارانیان دەکات، بەمەش ئاگر لە زۆربەی کەشتیەکانیان بەربوو لەناوچون و بەشەکەی تریشی بڵاوبونەوە، هەروەها هێزەکانی بەربەڕۆسا توانیان ٣٦ کەشتی دوژمن بە سەرنشینەکانی سەریەوە بەدیل بگرن، لەم جەنگەدا هەزاران سەرباز لە وڵاتە جۆربەجۆرەکان کە بەژداری ئەم جەنگەبوون بەدیلگیران، بەڵام ئەندریا دۆریا لەگەڵ ئەو سەربازانەی لەگەڵی مابوون توانی ڕابکات.

- عبدالعزیز پرسی: ئەی چەند کەشتی لە کەشتیەکانی بەربەڕۆسا لەم جەنگەدا نوقم بوون؟

- ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە عبدالعزیز ئەوەیە، ئەم سەرکردە گەورەیە توانی ئەم جەنگە بە چەند کاتژمێرێک لە بەرژەوەندی مسوڵمانان یەکلایی بکاتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەشتیەک لەدەست بدات! ئەمەش وایکردوە زۆرێک لە مێژوونوسان

به یەکێک لە گەورەترین سەرکردە دەریاییەکانی دابنێن لە تێکڕای مێژووی مرۆڤایەتی.

- ئای لەم جەنگە! ئەوە سەیرە ئێمە هیچ شتێکمان لە کتێبەکانی مێژوو لەبارەی ئەم جەنگە نەخوێندۆتەوە!! بەڵام نیزال پێم بڵێ ئەم سەرکەوتنە دەریاییە گەورەیەی مسوڵمانان دەنگدانەوەی لە هەردوو دونیای ئیسلامی و مەسیحی چۆن بوو؟

- خاچپەرستەکان ئەم جەنگە بە کارەساتێکی گەورە دادەنێن کە بەسەریان هاتوە و دوای ئەوە بۆ چەندین ساڵ کۆنترۆڵی دەریای سپی ناوەڕاستیان لەدەست دا، بەڵام خەلیفەی عوسمانی سوڵتان سلێمانی قانونی بە سوجدەبردن بۆ خودای گەورە پێشوازی لەم سەرکەوتنەکرد و خۆی پێشوازی لە بەربەڕۆسا و سەرکردە جەنگیەکانی تر و تەواوی سەربازانی بەژداربووی ئەم جەنگە کرد، تا ئەمڕۆش بەرواری جەنگی برۆزەی دەریایی ڕۆژی فەرمی هێزی دەریایی تورکییە، ئەم سەرکەوتنەی مسوڵمانان ڕێگە خۆشکەربوو بۆ ئازادکردنی زۆرێک لە شارەکانی باکوری ئەفریقیا لەدەست خاچپەرستان، هەروەها بەربەڕۆسا چەتەکانی قدیس یۆحەنای ڕاونا توانی گورزی کاریگەریان لێبوەشێنێت.

- چیرۆکی ئەم چەتانە چین کە زۆرجار ناویان پەیوەستە بە چیرۆکی برایانی بەربەرۆسا؟

- (چەتەکانی قدیس یۆحەنا)، خۆیان ناو لەخۆیان دەنێن سوارچاکانی قدیس یۆحەنا.



کۆمەڵێکی تیرۆریستی بوون لە ترسناکترین گروپە تیرۆریستیەکان، خەریکی نانەوەی خراپەبوون لە دەریای سپی ناوەڕاست، ئەم چەتانە هەڵدەستان بە هێرشکردنە سەر کەشتیگەلە بازرگانیەکان، بەتایبەت کەشتی گەلی بازرگانە مسوڵمانەکان، سەرەتای گەشەکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ جەنگە خاچپەرستیەکان لە فەلەستین، پێیان دەوترا (سوارچاکانی هۆسپیتالیە) (Hospitaller Knights)، لەکاتی جەنگی خاچپەرستەکان ناوبانگیان دەرکرد بە توندڕەوی ئاینی و ڕقی نۆریان بەرانبەر ئیسلام، دەیان کۆمەڵکوژی ترسناکیان لە فەلەستین دژی هاوڵاتیانی مسوڵمانی مەدەنی ئەنجام دا، تاوەکو سەرکردەی مسوڵمانی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی) لە فەلەستینی دەرکردن، دوای دەرکردنیان لە فەلەستین لە دوورگەی ڕۆدس لەدەریای سپی ناوەڕاست نیشتەجێبوون و کردیانە بنکەی خۆیان بۆ کارەکانیان لەدەریای سپی، تاوەکو وایان لێهات بوو بوونە مەترسیەکی ڕاستەقینە لەسەر بازرگانی نێودەوڵەتی لەدەریای سپی، دەیان کوشتارگەیان ئەنجامدا بەرانبەر خەڵکی مەدەنی بەتایبەت مسوڵمانان، تاوەکو سوڵتانی گەورە سوڵتان سلێمانی قانونی

بڕیاریدا سنورێک بۆ دەست درێژەکانیان دابنێت و خۆی سەرکردایەتی کەشتیگەلێکی گەورەی کردو بەرەو ڕۆدس بەڕێکەوت. چەتەکانی قدیس یۆحەنا خۆیان لەناو قەڵاکانیان حەشارداو هێزی تۆپ هاوێژی ئیسلامی بە بەردەوامی قەڵاکانیانی تۆپباران دەکرد. دوای ئەوەی هێزی ئیسلامی نەیتوانی لەسەر دیواری قەڵا پۆڵاینەکانیان بۆیان بچێت، قانونی بڕیاریدا لەژێر زەویەوە بۆیان بچێت و بڕیاریدا بە هەڵکەندنی ٥٠ ژێرزەمین لەژێر دیوارەکانی قەڵای ڕۆدس، تاوەکو لەڕێیەوە هێزی تایبەتی سەر بە هێزی خەلافەی ئیسلامی عوسمانی دزەبکاتە ناو دڵی دوژمن، بۆ چاندنی مین لەژێر زەوی قەڵای ڕۆدس، چەتەکان لەناکاو بینیان زەوی لەژێریان دەلەرزێت، لە پاشان هێزی ئیسلامی لێهاتە دەرەوە، بۆیە خۆیان بەدەستەوەدا و سوڵتان سلێمان سەلامەتی پێبەخشین بەرانبەر ئەوەی بە تەواوی لە دورگەی ڕۆدس بکشێنەوە، دوای ئەوە ئەم دورگەیە بووە بنکەیەکی گرنگ بۆ هێزی دەریایی عوسمانی بۆ سەدان ساڵ.

- دوای ئەوە ئەم چەتانە ڕویان کردە کوێ؟
- دوای دەرکردنیان لەسەردەستی سوڵتان سلێمان چەتەکانی قدیس یوحەنا ڕویان کردە دورگەی ماڵتاو کردیانە بنکەی سەرەکی، دواتر بە سوارچاکانی ماڵتا (Knights of Malta) ناسران، دوای ئەوە ماڵتا گۆڕا بۆ بنکەیەکی تازە بۆ دەرچونی کردارە تیرۆریستیەکانیان دژی کەشتی مسوڵمان و مەسیحیەکان، تاوەکو لە ساڵی ١٧٩٨ز سەرکردەی فەرەنسی ناپلیۆن بۆناپارت بڕیاریدا

بەیەکجاری لەناویان ببات، بەڵام سەرەڕای پەرتوپڵاوبونیان بەشێوەی ڕێکخراوی نهێنی لە ئەوروپا مانەوە لەژێر پەردەی کاری خێرخوازی و هەڵسان بەدامەزراندنی ڕێکخراوی (سوارچاکانیماڵتا) کە وەکو دەوڵەتێکی گریمانەیی وایەو تا ئێستا زیاتر لە سەد دەوڵەت دانی پێدامێناوە، هەروەها پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ (سوارچاکانی پەرستگا) (Knights Templar) هەیە، کە ئەم ڕێکخراوە لە ئێستادا کاریگەری گەورەی لەسەر دەزگا بڕیاردەرەکانی ئەمریکا هەیە، کۆمەڵێک ڕاپۆرتیش باسی ئەوە دەکەن یەکێک لە گەورەترین کۆمپانیا بەکرێگیراوەکان هیچ نیە جگە لە ڕوکارێکی تازەی سوارچاکانی ماڵتای خاچپەرست.

- عبدالعزیز قسەکەی پێ بڕی و گوتی: یەک خولەک نیزال

- چی بووە هاوڕێ؟

- وابزانم ئێستا نهێنی یەکێک لە هێما مەترسیدارەکانی ناو نهێنی بەربەڕۆسام زانی!

- مەبەستت چیە عبدالعزیز؟!

- ژمارە ٣٥٦ کە لەناو یەکێک لە هێما مەترسیدارەکانی خوارەوەی نهێنی بەربەرۆسا هەیە، هاوڕێیەکی لیبیم هەیە لە ماڵتا دەژیت و پەیوەندی تەلەفۆنیم لەگەڵی هەیە، ئەگەر هەڵە نەبم سەرەتای ژمارەکەی بە ژمارە ٣٥٦ دەستپێدەکات!

- جوانە عبدالعزیز، چۆن بە خەیاڵی خۆمدا نەهات کە دەکرێت ئەم هێمایە سەرەتای ژمارەیەکی نێودەوڵەتی بێت؟ بونی ژمارەی سەرەتای تەلەفۆنی ماڵتا لە سێگۆشەی مەترسی لە نهێنی

بەریەرۆسا، بێ هیچ گومانێک ئاماژەیە بۆ ترسناکی چەتەکانی قدیس یۆحەنا.

- ئەمە واتــای ئەوەیە ئەم چەتــانە ئێســتا بەدوای نهێنــی بەریەرۆسادا دەگەڕێن؟

- لەوە دڵنیا نـیم هـاوڕێ، بەڵام وادیـارە ئەو کەسـەی نهێنـی بەریەرۆسـای دانـاوە ویسـتویەتی لە مەترسـی ئاشـکرابونی نهێنـی بەریەرۆسا ئاگادارمان بکـاتەوە، لەلایەن یەکێـک لە ڕێکخراوەکـان کە لەم سەردەمەدا ئەم ڕێکخـراوە خـۆی لەپەنایـدا حەشـارداوە، وادیـارە مەترسیەکەش ڕاستەقینەیە، بەپێـی مێژووی خوێنـاوی ئەم چەتـانە، هەروەها بەپێی ئەو دوو سوارچاکە کۆیلەیەش کە لە شیعرەکەی زیـر سالم ئاماژەیەن پێکراوە، کە لە سەرەوەی ئەم دوو ژمارە دانراون.

- ئەمە لێکــدانەوەیەکی گونجــاوە، بەڵام ئەی سێگۆشــەی مەترسـی دووەم؟ ئێســتا لە ئینتەرنێـت بەدوای هێمـای تەلەفـۆنی نێودەوڵەتی ٤٢٠٠ گەڕام، ئەم ژمارەیە کۆدی کۆماری چیکە، پێتـوایە هیچ پەیوەندیەک لە نێوان کۆمار چیک و نهێنی بەریەرۆسا هەبێت؟

- ئێستا هیچ شتێک بە خەیاڵمدا نایەت پەیوەندی بە کۆمـاری چیکەوە هەبێـت، بـا ئەمە بـۆ کـاتێکی تـر دوابخەیـن، ئێسـتاش بێــــــــزەحمەت تــــــــۆپەکەم بۆهەڵــــــــدە.

عبدالعزیز شـوتێکی لە تـۆپەکەدا بەرەو نیـزال، نیـزالیش تـۆپەکەی بەدەست گرت و خستیە ناو پەیکەری کەشتی برایانی بەریەرۆسا.

- چیــــدەکەی نیــــزال؟ شــــێت بــــووی؟!

نیزال لە عبدالعزیز نزیک کەوتەوە و بەگوێی چرپاند:

- باش گوێبگرە عبدالعزیز، لەوانەیە داوێکی تری نهێنی بەربەرۆسا لەناو ئەم کەشتیە برۆنزیە بێت، بۆیە سەر دەکەومە ناو کەشتیەکەوە، تۆش پاسەوانییم لێبکەو پێش ئەوەی کەسێک بێت ئاگادارم بکەرەوە، ئەگەر کارەکەشمان ئاشکرابوو لەلایەن یەکێکەوە وا دەزانن بۆ هێنانەوەی تۆپەکەم چوم.

- لەبەر ئەوە ئەم تۆپە هەوایەت کڕی و واتلێکردم بەدرێژایی شەو یاریت لەگەڵ بکەم؟

- ئەم بینایە نرخێکی مێژووی گەورەی هەیە عبدالعزیز، ڕێزگرتنیشی واتە ڕێزگرتنی مێژووی بەربەرۆسا و مێژووی ئەم وڵاتە، بۆیە نابێت هیچ زیانێکی پێبگەیەنین، تەنانەت ئەگەر ئامانجەکەشمان چاکەبێت، بۆیە ئەم تۆپە سوکە کارەکەمان بۆ دەکات و هیچ زیانێک بە ناوەوە ناگەیەنێت، منیش هەوڵدەدەم بچمە ناو کەشتیەکە و بێمە دەرەوە بەبێ ئەوەی هیچ زیانێکی پێ بگەیەنم، ئێستاش چاوەکانت بکەوە و لەهەر شتێک ئاگادارم بکەوە!

لە چاوتروکانێکدا نیزال ئافورەکانی پەیکەرە مێژویەکەی تێپەڕاند و سەرکەوتە سەر بیناکە کە پەیکەرە برۆنزیەکەی لەسەر جێگیرکرابوو، نیزال بۆ چەند خەلەکێک ونبوو، کە بۆ عبدالعزیز وەکو ساڵ وابوو لەبەر دڵەڕاوکێی زۆر، پاشان نیزال لەناکاو دەرکەوتەوە و لەدەستێکی تۆپە هەوایەکەی هەڵگرتبوو لە دەستەکەی تریشی سندوقێکی مسی بچوکی هەڵگرتبوو کە لەسەر ڕوەکەی ژمارە ١٠٤ هەڵکۆڵرابوو!

***

## قاسە ژمارەیەکەی جەزەری

نیزال و عبدالعزیز بەخێرایی بەرەو ئەو هۆتێلە دەڕۆیشتن لە ناوەڕاستی شاری جیجلی جەزائیری تیایدا دەمانەوە، دوای ئەوەی نیزال سندوقە بچوکە مسییەکەی لە جانتاکەی شاردەوە، پاش ئەوەی دوو هاوڕێیەکە گەیشتنە هۆتێلەکەیان یەکسەر سندوقەکەیان دەرهێناو دەستیانکرد بە پشکنینی، بینیان سندوقەکە چوار پەپکەی کانزایی لەخۆدەگرێت، هەریەکەیان بە کۆمەڵێک ژمارە لەسەر شێوەی بازنەیی دەورەدراوە.



عبدالعزیز ئەوکاتەی لە سندوقە مسیەکە ورددەبویەوە پرسی:

- ئەمە چیە ١٠١؟
- پێموایە ئەم سندوقە قاسەیەکی ژمارەی یە، دیزاینکراوە لەسەر هەمان بنەمای ئەندازیاری قاسەکەی جەزەری.
- نیزال ئەو قاسەیەی جەزەری چیە کە باسیدەکەی ؟

- هاوڕێ، قاسەکەی جەزەری یەکەمین قاسەی ژمارەی یە لە مێـژوودا، زانـای مسـوڵمان ئیسـماعیل جەزەری پـێش ٨٠٠ ساڵ دروستیکردووە.

- سەیرە، هەرگیز گوێبیستی ناوی ئەم زانا مسوڵمانە نەبوم لە ژیانمدا!

- بەداخەوە عبدالعزیز زۆرێک لە زاناو داناکانمان لە کتێبەکانی خوێندن و بەرهەمە ئەدەبیەکانمـان بەهـیچ شـێوەیەک بـاس نـاکرێن، سـەرەڕای بەشـداری گەورەیـان لە بەرەو پێشـبردنی شارسـتانیەتی زەوی و ڕەگەزی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو.

- ئـایە جەزەری زانـا لەنێـو ئەو زانایـانە بـووە کە بەشداریانکردوە لە بەرەوپێشبردنی شارستانیەتی مرۆڤ؟



- زۆرێـک لەو داهێنـان و ئـامێرانەی لە دەوروبەرت ئێسـتا

دەیانبینی لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوەکانی ئەم زانا بلیمەتە.

- تامەزرۆت کردم نیزال بۆ زانینی ژیانی ئەم زانا مسوڵمانە، دەتوانی کورتەیەک لە ژیانیم بۆ باسبکەی؟

- ناوی تەواوی (ابو العز بن اسماعیل بن الرزاز الجزري)یە، ناسراوە بە (بدیع الزمان) لە جەزیرەی ئیبن عمر (کە ئێستا دەکاتە شاری جزیرەی باکوری کوردستان، وەرگێڕ) لە دایکبووە، نازناوەکەشی لە ناوی شاری جزیرەوە هاتوە، لە نێوان سەدەکانی دوازدە و سێزدەی زاینی ژیاوە، بەدامەزرێنەری ڕاستەقینەی بزوێنەرە میکانیکیەکان دادەنرێت، کە ئەمڕۆ پیشەسازی ئۆتۆمبێل و ئامێرەکانی تری لەسەر بەندە، ئەمەش دوای ئەوەی ئەم زانایە سەلماندی کە دەکرێت جوڵەی بازنەیی بۆ هێزێکی پاڵنەر بۆ پێشەوە بگۆڕدرێت، جەزەری داهێنەری (شەفتی کام)ە (Camshaft)، ئەویش ئەو ستونەیە بە پاڵەپەستۆی پستۆنی بزوێنەرەکە بۆ دروستکردنی هێزی پاڵنەر بۆ پێشەوە دەخولێتەوە وەکو چۆن لە بزوێنەری ئۆتۆمبێلەکاندا ڕوودەدات، هەروەها جەزەری زانستی دروستکردنی کاتژمێری نوێی دانا، دوای ئەوەی ددانەی بۆ زیادکرد، هەروەها ترۆمپای ئاو کە بە شێوەیەکی میکانیکی کاریدەکرد دروستکرد، دوای ئەوەی ترۆمپاکانی پێشوتر لەڕێی بەکارهێنانی جوڵەی ئاژەڵەکانەوە کاریاندەکرد، هەروەها جەزەری سودی لە تەوژمی ئاو بۆ دروستکردنی جوڵە و وزە بینی، کە بە بنچینەی

پیشەسازی وزەی هایدرۆلیکی دادەنرێت، تەنانەت گلۆپە کارەبایەکانیش کە دەیانبینی، بیرۆکەی کارکردنی دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک لە داهێنانەکانی ئەم زانا مسوڵمانە.

- ئای خوایە! پێشتر هەموو کاتێک کە داهێنانە تازەکانم دەبینی پێم وابوو مسوڵمانان بارن بەسەر شارستانیەتی مرۆڤ!

- عبدالعزیز ئەمە بەهیچ شێوەیەک ڕاست نیە، وەکو مسوڵمانێک نابێت هەرگیز هەست بەکەمی بکەیت لە بەرانبەر گەلانی تردا، تۆ سەر بە گەلێکی گەورەی کە بەژداریەکی گەورەی لە بەرەوپێشبردنی مرۆڤایەتی کردووە، زۆرێک لە داهێنانەکانی ئەمڕۆ بۆ ماندووبونی زانا مسوڵمانەکان دەگەڕێتەوە، باپیرانمان بەژداری گەورەیان لەم پێشکەوتنەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی کردوە، زاناکانی خۆرئاوا سودیان لە هەوڵی زانا مسوڵمانەکان بینیووە، وەکو چۆن مسوڵمانانیش سودیان لە هەوڵی هیندی و چینی و ئیغریقی و شارستانێتیەکانی پێشوی مرۆڤایەتی بینیووە، زانست، سیفاتی کەڵەکەبونی هەیە، ئەوە بەسە کە بزانی زانا و هونەرمەندو داهێنەری ئیتاڵی بەناوبانگ (لیۆناردۆ داڤنشی) (Leonardo da vinci) لە دیزاینکردنی هەندێک لە داهێنانەکانی سودی لە هەوڵەکانی زانای مسوڵمان جەزەری بینیوە، ئەمەش دوای خوێندنەوەی پەرتوکێکی وەرگێڕدراوی ئیتاڵی جەزەری کە وەرگێڕانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدە لە چاپخانەی بنەماڵەی (مەدیشی) کە فەرمانڕەوای فلۆرێنسا بوون لە ئیتاڵیا.



- ئایە جەزەری پەرتوکێکی دیاریکراوی هەیە؟

- جەزەری پوختەی داهێنان و دۆزینەوەکانی لە پەرتوکێکدا کۆکردۆتەوە کە بەماوەی ٢٥ ساڵ نوسیویەتی بەناوی (الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل)، بەکورتی بە (الحيل) ناسراوە، جەزەری ئەم پەرتوکەی بەڕێگایەکی ئاسان و ڕەوان داناوە، کە بە ئاسانی کەسانی گرنگیدەر بە زانستەکانی ئەندازیاری و داهێنان دەتوانن سودی لێ ببینن لە ڕێگای وێنە و شیکردنەوەکانی، بە شێوەیەک جەزەری بەوردی باسی دروستکردنی هەر یەکێک لە ئامێرەکانی کردووە، ئەم پەرتوکەش بە جوانترین پەرتوک دادەنرێت کە لە سەدەکانی ناوەڕاست دەربارەی ئامێرە میکانیکیەکان و هایدرۆلیکیەکان نوسرابێت، بە درێژایی مێژوو داهێنانەکانی جەزەری ئەندازیارەکانی توشی سەرسوڕمان کردووە، پەرتوکەکەشی بۆ زۆرێک لە زمانە زیندوەکانی جیهان وەرگێڕدراوە و نوسخەیەکیشی لە زۆرێک لە مۆزەخانەکانی جیهان هەیە وەکو مۆزەخانەی لۆڤەر لە فەڕەنسا و مۆزەخانەی هونەرە جوانەکان لە بۆستن و کتێبخانەی زانکۆی ئۆکسفۆرد.

- عبدالعزیز بە زەردەخەنەوە گوتی: وادیارە زانیاری زۆرت دەربارەی ئەم زانا مسولْمانە هەیە ١٠١، هیوادارم لە نێو زانیاریەکانتدا ڕێگای کردنەوەی ئەم قاسە ژمارەیەشی تێدابێت.



- ئەم قاسەیەش یەکێکە لە داهێنانەکانی جەزەری، وەکو پێم وتی یەکەم قاسەی ژمارەی یە لە مێژوودا، جەزەری دیزاینیکردوە بەشێوەیەکی بلیمەتانە، دەتوانرێت بکرێتەوە تەنها لەڕێگەی دانانی ئەم چوار پەپکەیە لەسەر ژمارە ڕاستەکان لە یەک کاتدا، تەنانەت ئەگەر سێ پەپکەش لەسەر ژمارەی ڕاست بێت ناکرێتەوە.

- کارەکە زۆر ئاسانە نیزال، پەپکەکان لەسەر چوار ژمارەی دوای ژمارە ١٠٤ دابنێ، ژمارەکانیش ئەمانەن ١٠٨, ١٠٧, ١٠٦, ١٠٥.

- عبدالعزیز، جوان سەیری ژمارە هەڵکۆڵراوەکان بکە لە دەوری پەپکەکان، ئەو ژمارانەی کە پێویستە پەپکەکانی لەسەر دابنێین دەکەوێتە نێوان ژمارەکانی ٢١٠ و ٢٢٠، ئەم ژمارانەش لە نهێنی بەریەرۆسا بونیان نیە.

بەڵام ئەم ژمارانە چین کە ئەم قاسە سەیرە دەکاتەوە؟!

نیزال بۆ ساتێک بێدەنگ بوو سەیری ژمارە ١٠٤ی دەکرد کەلەسەر قاسەکە هەڵکۆڵرابوو پاشان وتی:

- پێم وایە کارەکە پەیوەندی بە بەدویەکداهاتوەکانی فیبۆناتچی هەیە کە لە فەرەنسا لەژێر ژمارە ١٠٤ دەستمان کەوت.

- ئایە پێویستە لەسەرمان ئەو ژمارانە بەکاربهێنین کە لە بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچیدا هەن؟

- بەتەواوی مەبەستم ئەوە نەبوو عبدالعزیز، ژمارە نهێنیەکان پێویستە لەنێوان ٢١٠ تاوەکو ٢٢٠ بێت، بۆیە پێم وایە پێویستە ئەو سێ ژمارەیەی لە نهێنی بەربەرۆسا هەمانە لەگەڵ بنەمای بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی یەکبخەین تاوەکو ژمارەی تازەمان دەستبکەوێت کە بتوانین قاسەکەی پێ بکەینەوە.

- هیچ تێنەگەیشتم لەوەی وتت!

- عبدالعزیز، تکایە هەستە پەپکەکان لەسەر ئەو ژمارانە دابنێ کە پێت دەڵێم .

عبدالعزیز قاسەکەی جەزەری لەبەردەستی خۆی داناو یەک یەک پەپکە کانزایەکانی لەسەر ئەوژمارەانە دادەنا کە نیزال پێی دەوت.

- ژمارەی یەکەم پێویستە کۆی دوو ژمارەی دوای ١٠٤ بێت، کە دەکاتە ژمارەکانی ١٠٥ و ١٠٦، بۆیە عبدالعزیز پەپکەی یەکەم لەسەر ژمارە٢١١ دابنێ.

ژمارەی دووەم هاوڕێ، پێویستە کۆی ژمارەکانی ١٠٦ و ١٠٧ بێت، کە دەکاتە ژمارە ٢١٣، بەڵام ژمارەی سێیەم پێویستە کۆی

ژمارەکـانی ١٠٧ و ١٠٨ بێـت کە دەکـاتە ٢١٥، هەروەهـا ژمـارەی چوارەم دەکاتە ئەنجامی کۆکردنەوەی ژمارەکـانی ١٠٨ و ١٠٩، بۆیە پەپکەی چوارەم لەسەر ژمارە ٢١٧ دابنێ.

هەرکە عبدالعزیز پەپکەی چوارەمی لەسەر ئەو ژمارەیە دانا کە نیزال پێی وت ڕاستەوخۆ دەرگای قاسەکە کرایەوە، دوو هـاوڕێکە بەمە زۆر خۆشـحاڵبوون و کەوتـنە پشـکنینی نـاوەوەی سـندوقەکە، لە ناویدا تەنهـا بلیتێکـی ئەلیکترۆنیـان دۆزیەوە کە هێمـای بەریـدی تونسـی لەسەربوو، بلیتەکە ژمارە ١١٠ی هەڵگرتبوو!

❊❊❊

## جیۆڤانی

## سەرکردەی مسوڵمانی ئیتاڵی

- عبدالعزیز وتی: ئەم بلیتە چیە؟
- نیزال لە کاتێکدا بلیـتەکەی دەپشـکنی گـوتی: هـاوڕێ ئەمە بلیتێکی پۆستەی ئەلیکترۆنی بەکرێگیراوە، سەربە پۆستەی تونسی.
- سندوقێکی پۆستەی بەکرێگیراو!
- خزمەتگـوزاریەک هەیە، لە هەنـدێک لە بەڕێوبەرایەتیەکـانی پۆسـتە لە جیهـان، پێشکەشـی ئەو کەسـانەی دەکەن کە ناونیشـانی پۆستە یاخود شوێنێکی نیشتەجێبونی جێگیریـان نـیە، ئەم کەسـانە دەتوانن سندوقێکی پۆستە لای بەڕێوبەرایەتیەکی پۆستە بەکرێبگرن و لەڕێـیەوە پێشـوازی لەو پۆسـتانە بـکەن کە بۆیـان دەنێردرێـت،

پێموایە ئەم بلیتە ئەلیکترۆنیەش کلیلێکی ئەلیکترۆنی یەکێک لە سندوقە پۆستەبەرەکانی سەربە پۆستەی تونسیە، کە دانەری نهێنی بەربەرۆسا بەکرێی گرتوە، بۆ ئەوەی داوی دواتری نهێنیەکەی لەناو دابنێت.

- بەڵام بلیتەکە هیچ ناونیشانێکی لەسەر نیە، ئایە دەبێت لە هەموو سندوقە پۆستەبەرەکانی سەر بە پۆستەی تونسی بگەڕێین؟!

- بەدڵنیایەوە نەخێر عبدالعزیز، وادیارە بلیتەکە بێئاگای کردووی لەتێبینی کردنی هەڵکۆڵراوی بنمیچی ناوەوەی قاسەکە.

عبدالعزیز دوبارە سەیری قاسەکەی کردەوە و لە هەڵکۆڵراوی بنمیچی ناوەوەی قاسەکە ڕاما، هەڵکۆڵراوەکە پێکهاتبوو لە شمشێرێک کە پیتی (G) لەخۆگرتبوو، لە خوارەوەشی سێگۆشەیەک هەبوو کە وێنەی کەلەسەرێکی تێدا کێشرابوو.

- ئەمە چی یە ١٠١؟ ئەم شمشێرە کە پیتی (G) لەخۆگرتووە واتای چیە؟

- ئەم هێمایە هاورێ، هێمایە بۆ سەرکردەیەکی مسوڵمانی ئیتاڵی کە یەکێک بووە لە پیاوەکانی بەربەرۆسا، ئەم سەرکردە ئیتاڵییە نازناوەکەی بریتی بووە لە (شمشێری بڕندە)، بەڵام ناوە ڕاستەقینەکەی بە پیتی (G) دەستپێدەکات.

- سەرکردەیەکی ئیتاڵی؟ ئایە لەبەرئەوە دانەری نهێنی بەربەرۆسا بەدوایەکداهاتنەکانی زانای ئیتاڵی فیبۆناتچی وەکو کلیلی گەیشتن بە ناسنامەی ئەم سەرکردەیە داناوە؟

- بیرم لەم هێماکاریە نەکردبویەوە، بەڵام لێکدانەوەکەت زۆر لۆژیکیە عبدالعزیز، وادیارە دانەری نهێنی بەربەڕۆسا پەتەکانی نهێنیەکەی زۆر بەجوانی بەیەکترەوە گرێداوە.

- نیزال بەڵام ئەم سەرکرە ئیتاڵیە کێیە؟

- ئەو یەکێک بووە لەو سەرکردانەی لەژێر سەرکردایەتی گشتی خیرالدین بەربەڕۆسا جەنگاوە، پێش ئەوەی ببێتە والی جەزائیر و ئەمیری ویلایەتەکانی باکوری ئەفریقیا، دوای ئەوەش بۆتە سەرکردەی گشتی هێزی دەریایی عوسمانی، ئەو یەکێکە لە گەورەترین سەرکردە دەریایەکان لە مێژوودا، ئەو سەرکردە مسوڵمانە ئیتاڵیەی پلانی گێڕانەوەی ئەندەلوسی دوای دەیان ساڵ لە داگیرکردنی دارشت، سەکردەی مسوڵمانی ئیتاڵی (جیۆڤانی دیونیدجی گالینی) (Giovanni Dionig Galeni)، کە دوای مسوڵمان بوونی ناوەکەی دەکاتە (ئولوج عەلی)، نازناوەکەشی بریتیە لە (شمشێری برندە)، لە هەرێمی کلابریای ئیتاڵی لەدایکبووە، جیۆڤانی هەمان سەرکردەیە کە ڕۆماننوسی بەناوبانگی ئیسپانی (میشێل دی سێرڤانتس) بەناوی (ئوچالی) (Uchali) لە ڕۆمانی جیهانی بەناوبانگ (دۆن کی شۆت) ناویدەبا، لە کاتێکدا خەلیفەی عوسمانی (سەلیمی دووەم کوڕی سلێمانی قانونی) نازناوی (کلج عەلی) واتە شمشێری برندەی پێدەدات وەکو ڕێزێک بۆ ئازایەتیەکەی.

- ئەمە یەکەمین جارە لە ژیانم ناوی ئەم سەرکردە مسوڵمانە ئیتاڵیە ئەبیستم!

بەداخەوە عبدالعزیز ئێمە هەموومان کەمتەرخەمین لە زانینی مێژووی پاڵەوانەکانمـان کە ڕێـڕەوی مێژویـان گـۆڕی، لە کاتێکـدا گەلانی تر ڕێز لە مێژووی پاڵەوانەکانیان دەگرن و چیرۆکەکانیان هەر لە بچـوکیەوە بـۆ منـداڵەکانیان بـاس دەکەن بـۆ ئەوەی گیـانی باوەڕبەخۆبوون و هیـوا لە دڵیانـدا بڕوێنن، بەوەی کە ئەمـان ڕۆڵەی ئەم پاڵەوانـانەن، ئـێمەش چیرۆکـی ئەفسـانەیی بـۆ منـداڵەکانمان دەگێڕینەوە کە هیچ بنەما و واتایەکی ئەخلاقی نیە، وەکو چیرۆکـی عەلـی بابـاو عەلائەدیـن و دەیـانی تـر، کە منـداڵەکانمان فێـردەکەن چاوەڕوانی بەدیهێنانی خەونەکانیان بن لە ڕێی بەدیهاتنی موعجیزەی وەکـو چـراکەی عەلائەدیـن یـاخود بەدەسـتهێنانی مـاڵێکی دزراو و دەسـت بەسـەرداگرتنی وەکـو ئەوەی عەلـی بابـا، ئەوەش بـزانە ئەو سـەرکردە مسـوڵمانە ئیتـاڵیەی کە ئـێمە هەر ناویشـمان نەبیسـتوە، خەڵکە مەسیحیەکەی ئەو شارە ئیتاڵیەی کە تیایدا لەدایکبووە ڕێزی لێـدەگرن، ئەگەر ڕۆژێـک ڕێـت کەوتە شـاری (لیکاسـتێلا) ( Le Castella) لە هەرێمـی کالابریـا لە باشـوری ئیتاڵیـا، دەبینـی پەیکەرێکیان بۆ ئەم سـەرکردە مسـوڵمانە دروسـتکردووە و، خەڵکی ناوچەکە شانازی پێوەدەکەن.



- ئایە هەربەڕاست ئەم سەرکردە مسوڵمانە ئیتاڵیە پلانی بۆ گێڕانەوەی ئەندەلوس دانابوو؟!

- لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەو لەگەڵ دەرکەوتنی ئەستێرەی کلیج عەلی لە ئەنجامی سەرکەوتنە زۆرەکانی لە دەریای سپی ناوەڕاست، خەلیفەی عوسمانی سەلیمی دووەم کوڕی سلێمانی قانونی بە مەرسومێکی سوڵتانی کردیە ئەمیری جەزائیر، لەم کاتەشدا جەزائیر گەورەترین بنکەی جیهادی دەریایی ئیسلامی بود لە دەوڵەتی عوسمانی، دوای وەرگرتنی ئەم پۆستە، جیۆڤانی چاوی بڕیە ئازادکردنی تەواوی خاکی باکوری ئەفریقیا لەدەست خاچپەرستەکان، لەگەڵ زیادبونی ژمارەی ئاوارە ئەندەلوسیەکان لە مسوڵمان و جولەکە کە لەدەست دادگاکانی پشکنینی ئەندەلوس ڕزگاریان بوو بوو، ئەم سەرکردە ئیتاڵیە مسوڵمانە پلانی گێڕانەوەی ئەم ئاوارانەی بۆ زێدی باوباپیریان داڕشت، بۆیە پلانێکی توندوتۆڵی

بۆ گێڕانەوەی ئەنـدەلوس داڕشـت و پەرۆشـی جێبەجێکردنـی ئەم پلانەی لەگەڵ گوێبیسـتبونی چیرۆکـی ئـاوارە ئەوروپیەکـان زیـاد دەبوو، چیرۆکی دانیشـتوانە ڕەسـەنەکەی ئەنـدەلوس لە مسوڵمان و جولەکەکان، لەبارەی کوشتارگەو ئامرازەکـانی سـزادان لە دادگاکـانی پشکنینی کاسۆلیکی، کلیج عەلی توانی پیاوانی هەواڵگری ئیسلامی بنێرێتە کەناراوەکانی ئەندەلوس بۆ پێوەندیکردن لەگەڵ شۆڕشگێڕان و دیاریکردنی کـاتژمێری سـفر بـۆ دەسـتپێکردنی شۆڕشـی گەورەی ئەندەلوسی دژی پاشای قشتالە.

- بەیارمەتیت ساتێک نیزال... باسی کام شۆڕش دەکەی؟!
- ئەو شۆڕشـــەی کە دانیشـــتوانی ڕەســـەنی ئەنـــدەلوس (مۆریسکیەکان) پێی هەسـتان، کە لە مێـژوودا بە شۆڕشـی (چیـای البشرات) ناسراوە، لە ساڵی ١٥٦٧ز پاشای ئیسپانی (فیلیپی دووەم Felipe II) فەرمانێکی پاشایی دەرکرد بە نەهێشتنی هەموو جۆرە پێکەوەژیانێـک لەگەڵ ڕۆشـنبیری مۆریسـکی و، بەکارهێنـانی هەردوو زمـانی عەرەبـی و ئەمـازیغی قەدەغەکـرا، هەروەهـا بەکارهێنـانی جلوبەرگی مۆریسـکی قەدەغەکـرا و مۆریسـکیەکان ناچـارکران نـاوە مەسیحیەکان بەکاربێنن، هەروەهـا فەرمـانکرا بە لەنـاوبردنی تەواوی نوسراو بەڵگەنامەکـان کە بە زمـانی عەرەبـی نوسـرابوون و هەروەهـا فێرکردنـی منداڵانی مۆریسـکی لەسەردەسـتی قەشـە کاسـۆلیکەکان، لەژێـر ئەو داپڵۆســین و تیــرۆرەی دژی مۆریســکیە بێتاوانەکــان پەیرەودەکرا، شۆڕشێکی چەکداری دەستی پێکرد لەو ناوچانەی کە پێشوتر بەشێک بوون لە مەملەکەتـی غەرنـاتە، لە شـەوی سـەری

ساڵی ١٥٦٨ز سەرکردەی مۆریسکیەکان بە نهێنی کۆبونەوە و خۆیان لە مەسیحیەت دارنی و پەیمانیان دایە سەرکردەیەکی مۆریسکی بەناوی (فرناندۆ دو قورتوبە وبالۆر) ( Fernando de cordóba y válor)، ئەم سەرکردەیە ڕەچەڵەکی بۆ بنەماڵەی بەنی ئومەیە پاشایانی ئەندەلوس لە چەرخی زێرینی دەگەڕایەوە، ئەوساو ئێستاش ئەندەلوسیەکان ڕێزێکی تایبەت لە مێژووی ئەم بنەماڵە قورەیشیە دەگرن، کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەواندا ئەندەلوس ڕۆشنترین سەردەمی شارستانیەت و پێشکەوتن و پێکەوەژیانی بەخۆوەدیوە، فرناندۆ ناوەکەی گۆڕی بۆ ناوێکی ئیسلامی (محمد بن امیة)، ئەم سوارچاکە ئەندەلوسیە پێشەوایەتی باشترین شۆڕشی کرد، کە ئەندەلوس بەخۆیەوە دیوە دوای کەوتنی، لە مێژوودا بە ڕاپەڕینی چیای بوشرات ( Rebelión De Las Alpujarras)ناسراوە، ئەم سەرکردەیە توانی مۆرسکیەکان یەکبخات و سوپای گەل دروستبکات کە زۆربەیان لە شۆڕشگێڕە مەدەنیەکان بوون، ڕاپەڕینی بەنی ئومەیە شێوەی جەنگی دەستەیی دژی سوپای قشتاڵە لە چیای بوشرات وەرگرت، بەردەوام سوپای شۆڕشگێڕان لەزیادبوون بوو بە شێوەیەک لە ساڵی ١٥٦٩ز ژمارەیان لە چوار هەزارەوە زیادیکرد بۆ ٢٥ هەزار کەس لە ساڵی دواتر، ڕەنگە توشی سەرسوڕمان ببی عبدالعزیز، گەر بزانی هێزەکانی محمد بن امیة توانیان هەریەک لە شارەکانی (ئەلمێریا) و (مەلەگا) لەدەستی پاشای قشتاڵە ئازادبکەن.

ڕۆڵی عوسمانیەکان و سەرکردەی ئیتاڵی کلیج عەلی لەم شۆڕشەی ئەندەلوس چی بوو؟

ئەگەر خودای گەورە دەوڵەتی عوسمانی بۆ مسوڵمانانی ئەندەلوس فەراهەم نەکردایە ئەم شۆڕشە گەورەیەی ئەندەلوس ئەنجام نەدەدرا کە بە سەرباز و چەک یارمەتیدەریان بوون، سەرکردەی ئیتاڵی کلیج عەلی لە لایەن خەلیفەی عوسمانی سەلیمی دووەم ڕاسپێردرابوو بەیارمەتیدانی بێتاوانانی ئەندەلوس کە مەینەتی زۆریان بینیبوو لەژێر سایەی دادگا ترسناکەکانی پشکنین، بۆیە کلیج عەلی کەشتیگەلی عوسمانی کە لە ٤٠ کەشتی پێکهاتبوو نارد بۆ بەندەری ئەلمێریە و توانی بڕێکی زۆر ئازوقەو کۆمەکی بگەیەنێتە شۆڕشگێڕان لە چیاکانی ئەندەلوس، کلیج عەلی هێزی دوژمنی پەرتکرد بۆ چەند ناوچەیەک تاوەکو پاڵەپەستۆ لەسەر شۆڕشگێڕانی مسوڵمان لە ئەندەلوس کەمبێتەوە، هەربۆیە ئەم سەرکردەیە هەستا بە ئامادەکردنی ١٤ هەزار سەربازی عوسمانی و ٦٠ هەزار سوارچاکی جەزائیری و ناردنیان بۆ شاری (مستغنام) تاوەکو بەهێرشێکی ڕێکخراو هێرشبکەنە سەر بنکەی سەربازی ئیسپانی لە شاری وەهرانی داگیرکراو، لەهەمان کاتدا هەستا بە ئامادەکردنی کەشتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی و بەڕێکردنیان لە جەزائیرەوە بۆ کەناراوەکانی ئیسپانیا، بەڕاستیش کلیج عەلی توانی بگاتە کەناراوەکانی ئەندەلوس و دەیان سەربازی هێزی عوسمانی دابەزن و بگەنە ڕیزی شۆڕشگێڕان، پاشان کلیج عەلی بڕیاری دا خۆی سەرکردایەتی هێزێکی دەریایی بکات بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی خەڵکی

ئەندەلوس، بەڵام پێش ئەوەی بەڕێبکەوێت بۆ ئەندەلوس خەلیفەی عوسمانی سەلیمی دووەم نامەیەکی بەپەلەی بۆنارد بۆ بەشداریکردن لە جەنگێکی دەریایی گەورە کە پاپای ڤاتیکان خۆی سەرپەرشتی ئامادەکردنی دەکرد، بۆیە کلیج عەلی وازی لە بیرۆکەی چوون بەرەو ئەنـدەلوس هێنـا بـۆ گێـڕانەوەی، لە جیـاتی ئەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێـکەوت بـۆ بەژداریکـردن لەگەڵ هێـزی مسـوڵمانان لە جەنگێکی مەزن دژی هاوپەیمـــانی خاچپەرســـتی گەورە کە پاپـــا خـــۆی سەرپەرشتی دەکـرد، سـەرکردەی مسـوڵمانان بـۆ قسـەکردن لەسەر پلانی جەنگەکە کۆبونەوە، (مۆذن عەلی پاشا) سـەرکردەی دەریایی ئیسـلامی بـوو لەم جەنـگەدا، کە خـۆی لەبنەڕەتـدا سـەرکردەیەکی وشـکانی بـوو، لە کـاتی دانیشـتنی سـەرکردە مسـوڵمانەکان ڕای سـەرکردە دەریایەکـان لەنێوشـیاندا کلـیج عەلـی وابـوو نەچـنە نـاو جەنگەکەوە تەنها دوای تۆپ بارانکردنی کەشتیەکانی دوژمـن لەلایەن هێـزی تۆپهـاوێژی عوسـمانی، کە ئەمەش هەلێکـی گەورەدەدات بە کەشـتیگەلی عوسـمانی بـۆ ڕاونـانی کەشـتیگەلی خاچپەرسـتان، بە واتـــایەکی تـــر مانـــدوکردنی کەشـــتیگەلی خاچپەرســـتی پـــێش دەستپێکردنی جەنگ و دواتر سەرکەوتن بەسەریدا، بەڵام مۆذن علي پاشا ڕازی نەبوو بەگۆڕینی پلانەکەی، کاتێک سەرکردەکانی دەریایی کەشتیگەلی عوسمانی سوربونی سەرکردەکەیان بینـی داوایـان لێکرد بەلایەنی کەم جەنگەکە لە دەریایەکی کـراوە بـکەن لەبەرئەوەی ئەوە هەلی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنێت کە کەشتیەکانیان دەست پێشخەری بـــکەن و تۆپەکانیـــان بە باشـــترین شـــێوە دژی کەشـــتیگەلی

خاچپەرستان بەکاربهێنن، بەڵام ئەم پێشنیارەش ڕەتکرایەوە، لەم بارە سەختەدا، کلیج عەلی دەیزانی کە کارەساتێکی گەورە سەرەتاکانی دەرکەوتوە، بۆیە لەبەرانبەر سەرکردەکان وەستا و هاواریکرد: لەکوێن ئەوانەی لەگەڵ خیرالدین پاشاو طرغود پاشا دەجەنگان، بۆچی بێدەنگن، ئایە دەکرێت جەنگێکی دەریایی لە کەناراو بکرێت؟!

سەرەڕای ناڕازیبوونی ئەم سەرکردە ئیتاڵیە، بەڵام بڕیارەکە دەرچوو، کلیج عەلی بڕیاریدا بەژداری جەنگەکە بکات سەرەڕای ناڕازیبونی لە پلانی جەنگەکە و سەرکردایەتی باڵی چەپی کەشتیگەلی ئیسلامی پێسپێردرا و لە ٧ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٥٧١ز کەشتیگەلی هاوپەیمانی خاچپەرستان کە پێکهاتبوو لە دە دەوڵەتی کاسۆلیکی لەگەڵ کەشتیگەلی خەلافەتی عوسمانی لە جەنگی دەریایی (لیبانتۆ) ڕوبەڕوو بونەوە، لە ئەنجامی ئەو پلانە شکستخواردوەی سەرکردەی کەشتیگەلی عوسمانی، جەنگەکە بە شکستێکی گەورەی عوسمانیەکان کۆتایی هات و مؤذن علی پاشا شەهیدبوو دەست بەسەر ئاڵاکەی داگیراو نێردرا بۆ ڤاتیکان، ئەم ئاڵایەی مؤذن علی پاشا لە ڤاتیکان مایەوە تاوەکو لە لایەن پاپا (پۆلسی شەشەم) لە ساڵی ١٩٦٥ز بۆ تورکیا گێڕدرایەوە وەکو دەستپێشخەری ئاشتەوایی.

عبدالعزیز پرسی:

- کلیج عەلی پاشای سەرکردە چی بەسەرهات لەم جەنگەدا؟

- سەرەڕای شکستی مسوڵمانان لەم جەنگەدا، بەڵام کلیج عەلی توانی بە باشترین شێوە سەرکردایەتی پاڵی چەپی کەشتیگەلی ئیسلامی بکات و خۆڕاگربوو بەرانبەر کەشتی دوژمن و هیچ یەک لە کەشتیەکانی کە ژمارەیان ٤٢ کەشتی بوو لەدەست نەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم سەرکردە ئیتاڵیە توانی تیپی چەتەکانی قدیس یۆحەنا بەتەواوی لەناوببات و دەست بەسەر ئاڵاکەیاندا بگرێت، هەروەها دوای کوژرانی سەرکردە مسوڵمانەکانی تر توانی خۆی سەرکردایەتی ئەو ژمارە کەشتیە بگرێتە دەست کە مابونەوەو دەربازیان بکات لەو ئابلۆقەیەی دوژمن خستبونیە سەری.

- ئایە هێزی مسوڵمانان لە دەریای سپی ناوەڕاست دوای ئەو شکستەی توشیان بوو کۆتایی هات؟

- بەپێچەوانەوە عبدالعزیز ئەم شکستە سەرەتایەک بوو بۆ هەستانەوەیەکی تازەی هێزی دەریایی ئیسلامی، سەرەڕای ئەو سەرکەوتنە ڕێژەیەی هاوپەیمانی خاچپەرستی لە جەنگی لیبانتۆی دەریایی، بەڵام سەرکردە مسوڵمانەکان ئاڵاکەیان دانەناو یەکەمین هەنگاوەکانی هەستانەوەش گێڕانەوەی دڵنیایی بوو بۆ ڕۆحی مسوڵمانان، بۆیە کلیج عەلی دوای ئەم شکستە بڕیاریدا بچێتە ناو پایتەختی خەلافەت شاری ئیستەنبوڵ بەسەرکردایەتی کەشتیگەلێکی گەورە کە پێکهاتبوو لە ٨٧ کەشتی جەنگی، بەمەش دەنگی تەکبیر لە کەشتیەکان و لە جەماوەری مسوڵمان بەرزبویەوە کە پاڵەوانەتیەکانی ئەم سەرکردە ئیتاڵیەیان بیستبوو لە ڕزگارکردنی مسوڵمانان، خەلیفەی مسوڵمانان سەلیمی دووەم کوڕی سلێمانی

قانونی خودی خۆی چوو بۆ پێشوازیکردنی لە کەناراوەکانی ئیستەنبۆڵ، لەم ڕۆژەوە خەلیفەی عوسمانی ناوی ئولوج عەلی گۆڕی بۆ کلیج عەلی واتە شمشێری بڕندە، هەروەها خەلیفە فەرمانێکی سوڵتانی دەرکرد بە دامەزراندنی ئەم سەرکردەیە بە سەرکردەی گشتی کەشتیگەلی ئیسلامی، لەو ساتەوە ئەم سەرکردەیە دەستیکرد بەدووبارە بنیادنانەوەی کەشتیگەلی ئیسلامی، هەروەها سەلیمی دووەم بڕیاریدا بە گۆڕینی باخچە سوڵتانیەکەی بۆ بنکەی دروستکردنی کەشتی و تەواوی دارایی دەوڵەتی خستە بەردەست بۆ بنیادنانەوەی هێزێکی دەریایی بەهێزتر لەوەی پێشوی، تەنها دوای ساڵێک لە شکستەکەیان عوسمانیەکان توانیان هێزێکی دەریایی دروست بکەن کە بەهێزتربوو و ژمارەی زیاتر بوو لەو کەشتیگەلەی لە جەنگی لیبانتۆ تێکشکا، دواتر بەم کەشتیگەلە کلیج عەلی سەرکەوتنی گەورەی تۆمارکرد بەسەر کەشتیەکانی دوژمن و هێزی دەریایی عوسمانی بوە هێزی یەکەم لە دەریای سپی ناوەڕاست.

- لەم ماوەیەدا شۆڕشگێڕە ئەندەلوسیەکان چیان بەسەرهات؟

- بەداخەوە بەهۆی سەرقاڵی عوسمانیەکان لەم ماوەیەدا بە بەرپەرچدانەوەی مەترسی هاوپەیمانی مەسیحی لەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئیسپانەکان بۆ ئەندەلوسیەکان یەکلایی بونەوە، دوای ئەوەی پاشای ئیسپانی هەستی بە مەترسی ئەم شۆڕشەکرد، بۆیە داوای یارمەتی لە هاوپەیمانە کاسۆلیکەکانی کرد لە ئەورووپا و توانی ئەم شۆڕشە لەناوببات، دوای ئەوەی توانی سیخوڕ لە ناو ڕیزەکانی شۆڕشگێڕان دابنێت و سەرکردەکانی شۆڕشەکە بکوژێت، هەروەها

دەیان هەزار مۆریسکی بۆ شوێنە جیاوازەکانی ئیسپانیا کۆچ پێکرد، تاوەکو لەناو کۆمەڵگەی مەسیحی بتوێنەوە، هەروەها دەیان گوندی ئەندەلوســی بەتەواوی وێرانکــران تــاوەکو خەڵــکەکەی نەتــوانن بگەڕێنەوە نـاوی و چەنـدان خێزانـی قشـتاڵی لە بـاکوری ئیسپانیا هێنـران و لە ناوچەکـانی ئەنـدەلوس نیشـتەجێکران ، جـگە لەمەش هەزاران مۆریسکی کۆچیانکرد بۆ شوێنە جیاوازەکانی جیهان لەترسی داپڵۆسینی کاسۆلیکەکان لە ئیسپانیا، هەندێکیان توانیان بگەنە دوو کیشوەرەکەی ئەمریکا، هەندێکیشیان توانیان بگەنە ناوچە مسوڵمان نشـینەکانی بـاکوری ئەفریقیـا بەتـایبەت مەغریـب و جەزائیـر، تـا ئێسـتاش زۆرێـک لە خێـزانە مۆریسـکیەکانی ئەنـدەلوس لە بـاکوری ئەفریقیـا کلیلـی خانوەکانیـان پاراسـتوە کە کۆچیـان لێکـردووە لە ئەندەلوس .

عبدالعزیز بە چاوی پڕ فرمێسکەوە وتی:

- نیزال لە باکوری مەغریـب نـاوچە هەیە کە دانیشتوانەکەی زۆربەی مۆریسـکیە، وەکـو بـۆم باسـکردی داپیـرەم لە بـاوکمەوە مۆریسکیە، لەبیرمە چۆن پێش خەو هەندێک گۆرانی ئەندەلوسی بۆ گــوتین، کە بەزۆری دەربــارەی دووری یــاران و ســۆز بــوو بـۆ نیشتیمان.

- بـاش لە هەسـتەکانت تێـدەگەم هـاوڕێ، ڕەنـگە ئـێمەی فەڵەسـتینی باشـتر لەو بـارە تێـبگەین کە مۆریسـکیەکانی پێـدا تێپەڕیوە، ئەو گۆرانیانە تۆ لە داپیرەت بیستوتە هەمان گۆرانین کە مـن لە داپیـرەم دەمبیسـت دوای کـۆچکردنی لە گونـدەکەی پـاش

شکستی ساڵی ١٩٤٨ز، هەمان ئازار، هەمان دووری لە نیشتیمان، هەمان هەستکردن بە ستەم.

- بەڵام هەمــوو ئەمــانە چ پەیوەنـدیەکیان بە تونســەوە هەیە نیزال؟ چۆن ئەو شارە بدۆزینەوە کە ئەو نوسینگەی پۆستەی لێیە کە ئەم بلیتە ئەلیکترۆنیە هی ئەوە؟

- کارەکە پێوەندی بە شارێکی دیاریکراوی تونسیەوە هەیە، کە هێمای خوار شمشێرەکە ئاماژەی بۆ دەکات عبدالعزیز.

- مەبەستت ئەو نیشانەی مەترسیەییە کە لە سێگۆشەیەک و کەلەسەرێکی مرۆیی لە ناوەڕاستیدایە، پێکهاتووە؟

- کێ پێی وتـوی کە ئەم هێمایە هێمـای مەترسیە هـاوڕێ؟ بەڵام نیـزال ئەم هێمـایە بەزۆری لەســەر تەلەکـانی کارەبـا یـاخود هەندێک لەناوبەری مێروەکان هەیە وەکو هێمای مەترسی.

- ئەمە ڕاسـتە عبـدالعزیز، بەڵام وەکـو پێشـتر پـێم گـوتی دەکرێت هێمایەک زیـاتر لە واتـایەکی هەبێت، ئەم سێگۆشەیەی کە دەیبینـی هێمـایە بـۆ یەکێـک لە تـاوەرە مێـژوویە بەناوبانگەکـان کە شێوەی هەرەمی وەرگرتوە، بەڵام کەلەسەرەکەی ناوی ئامـاژە نـادات بۆ شتێکی تر، بەڵکو ئەوە خودی ڕاستیەکەیە!

- مەبەستت چیە نیزال؟ تکایە زیاتر بۆم ڕونبکەوە!

- پشتیوان بەخـوا دواتـر هەمـووت بـۆ ڕونـدەکەمەوە، کاتمـان نزیکە بۆ گەیشتن بە دورگەی جەربەی تونسی.

- دورگەی جەربە؟ بـــۆچی دورگەی جەربەی تونســـی بە دیاریکراوی؟!

- لەسەر کەناراوەکانی ئەم دورگەیە یەکێک لە بەناوبانگترین جەنگە دەریایەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ڕویداوە، سەرکردەی ئیتالّی کلیج عەلی یەکێک بوو لە سەرکردەکانی ئەم جەنگە، کەشتیگەلی دەریایی عوسمانی توانی بەرپەرچی خاچپەرستە داگیرکەرەکان بداتەوە کە پێکهاتبوو لە هاوپەیمانێتیەکی گەورە لە کەشتیگەلی شەش دەوڵەتی کاسۆلیکی، دوای سەرکەوتنی هێزەکانی عوسمانی لەم جەنگە، سەرکردەی عوسمانی فرمانیکرد بە کۆکردنەوەی کەلەسەری داگیرکەران کە لەمەیدانی جەنگەکە کەوتبوون، کەلەسەرەکان لەسەر یەکتری ڕیزکران تاوەکو تاوەرێکی لێ دروستبوو کە دەیڕوانیە کەناراوەکانی دورگەی جەربە، ئەم تاوەرە لە مێژودا ناسراوە بە (تاوەری کەلەسەرەکان).!

❊❊❊

## تونس

## منارەی زانست و بنکەی زانایان

لە ڕێگایان بەرەو دورگەی جەربە، نیزال و عبدالعزیز لەو ئۆتۆمبێلە دابەزین کە لە تونسی پایتەختەوە بەکرێیان گرتبوو بۆ نوێژکردن لە مزگەوتی عەقەبەی کوڕی نافیع لە شاری قەیرەوان، دوای ئەوەی دوو هاوڕێکە نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان بەیەکەوە کرد، دەستیان بە گەڕانکرد لە نێوان کۆڵەگەکانی ئەم مزگەوتە گەورەیە.

- عبدالعزیز تۆش هەستت بەوە کرد کە من هەستم پێکرد لەکاتی نوێژکردنم؟

- هەستێکی نامۆ بوو نیزال، لەکاتی نوێژکردن هەستم بە خشوعێکی سەیرکرد کە سەردەمێکە لێم ونبووە.

- ڕاستە هاوڕێ، ئەم مزگەوتە یەکەمین مزگەوتە لە مێژووی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی دروستکراوە، هەر لەم مزگەوتەوە تیشکی ئیسلام بڵاوبۆتەوە لە چوارچێوەی ئەفریقیا و ئەندەلوس، ئەوکاتەی سەرکردە عەقەبەی کوڕی نافیع شاری قەیرەوانی دامەزراند و کردیە پایەختی مسوڵمانان لە باکوری ئەفریقیا، سوربوو لەسەر دامەزراندنی مزگەوتێک کە قیبلەکەی زۆر وردبێت، هەربەم شێوەیە ئەو کاتەی عەقەبە میحرابی ئەم مزگەوتەی دانا زۆر سوربوو لە دیاریکردنی ئاڕاستەی قیبلە، بۆیە چەند ڕۆژێک چاودێری هەڵاتن و ئاوابونی خۆری دەکرد، هاوەڵەکانی پێیان وت کە خەڵکی مەغریب ئاڕاستەی قیبلەیان بەپێی ئەم مزگەوتە دادەنێن، بۆیە پێویستە خۆی هیلاک بکات لە دیاریکردنی، بەم جۆرە عەقەبە ئیجتیهادی کردوو ئیجتیهادەکەی پێکای و میحرابی مزگەوتی قەیرەوان بوە پێشەنگی مزگەوتەکانی تری ڕۆژئاوای ئیسلامی، تەنانەت مێژونووسی بەناوبانگی دادوەرانی ئەندەلوس (محمد بن حارث الخشني) دوای ئەوەی لە شاری قەیرەوان دەگەڕێتەوە بەرەو شاری سەبتەی مەغریبی، تێبینی خواری ڕوگەی مزگەوتەکەی دەکات و هەڵدەستێت بە چاککردنەوەی ڕووگەی مزگەوتەکەی بەپێی ڕووگەی مزگەوتەکەی عەقەبە.

- ئەمە مزگەوتێکی زۆر گەورەیە نیزال، فراوانیەکەی بیری مزگەوتی حەسەنی دووەمم دەخاتەوە لە شاری (الدار البیضاء)ی وڵاتی مەغریب.

- ئەمە ڕاستە عبدالعزیز، مزگەوتی عەقەبەی کوڕی نافیع گەورەترین مزگەوتی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی بوو تاوەکو دروستکردنی مزگەوتی حەسەنی دووەم لە دار البیضاء لە کۆتایەکانی سەدەی ڕابردوو، ئێستاش بۆتە پلەی سێیەم دوای دروستکردنی گەورەترین مزگەوت لە ئەفریقیا و سێیەم لەسەر ئاستی جیهان دوای دوو حەرەمە پیرۆزەکە لەلایەن جەزائیرەوە، بەڵام مزگەوتی عەقەبەی کوڕی نافیع بەنەمری لە مێژووی مرۆڤایەتی دەمێنێتەوە، عبدالعزیز ئەم مزگەوتە یەکەم بنکەی بڵاوکردنەوەی زانست بوو لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی و ئەندەلوس، هەرلێرەشەوە کاروانی زانایان بۆ بڵاوکردنەوەی زانست لە ئەندەلوس و وڵاتانی ئەفریقیا بەڕێ کەوتوون، لێرەشەوە مەزهەبی مالیکی بە هەموو دونیادا بڵاوبویەوە.

- بەم بۆنەیەوە نیزال، پەیوەندی تونس چیە بە نهێنی بەربەڕۆسا؟

- عبدالعزیز، تونس یاخود بەدیاریکراوی دورگەی جەربەی تونسی بنکەی سەرەکی برایانی بەربەڕۆسا بوو، پێش ئەوەی جەزائیر ببێتە بنکەی ناوەندیان.

- مەبەستم ئەوە نەبوو نیزال، مەبەستم ئەوەبوو ئەو هێمایە کامەیە کە دانەری نهێنی بەربەڕۆسا ئاماژەی پێدەکات بۆ تونس لە میانەی ئاڵای بەربەڕۆسا.

نیزال وەڵامی دایەوە:

- هێمای ناوی چوار خەلیفە ڕاشدینەکە.

- پەیوەندی ناوی چوار خەلیفە ڕاشیدینەکە چیە بە تونس؟

- عبدالعزیز، تونس لەسەردەمی چوار خەلیفە ڕاشیدینەکە ئازادکراوە، کۆتا شوێن بووە لە باکوری ئەفریقیا لەدەستی داگیرکاری ڕۆمانی دەرهێنراوە لەسەردەمی خەلیفە ڕاشدینەکان، لەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان مسوڵمانان بە بەژداری ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەنێوشیاندا سەرکردە (عبدالله)کان: عبدالله ی کوڕی زوبێر و عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب و عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص و عبدالله بن سعد بن ابی سەرح و عبدالله ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، دەرچوون بۆ ئازادکردنی تونس وتوانیان سەرکردەی ڕۆمانی (گریگۆری بەتریک) (Gregory the Patrician) تێک بشکێنن، کە خۆی کردبویە پاشا لەسەر دانیشتوانی باکوری ئەفریقیا لە جەنگی (سبیطلة) لەساڵی ٦٤٧ز، دوای ئازادکردنی تونس لەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان، لە ئەنجامی ئەو فیتنەو ئاشوبەی لەو کاتەدا ڕویدا، پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لە باکوری ئەفریقیا وەستا ، دواتر لە سەردەمی ئومەییەکان، دووبارە مسوڵمانان گەڕانەوە بۆ تەواوکردنی پرۆسەی

ئازادکردنی وڵاتانی باکوری ئەفریقیا لە دەستی داگیرکاری ڕۆمانی ستەمکار، دواتر دانیشتوانی ڕەسەنی ئەم ناوچانە کە پێیان دەوترێت (ئەمازیغ) دەیان سەرکردەو زانایان لێ دروستبوو کە بەژداربوون لە گەشەسەندن وبەرەو پێشچوونی شارستانیەتی ئیسلامی بە درێژایی سەدەکان، دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز لە مزگەوتی عەقەبەی کوڕی نافیع دەرچوون ڕویانکردە چێشتخانەیەکی میللی لە قەیرەوان، ژەمێکی تونسی بەچێژیان خوارد، لەسەرەتادا نەیانزانی ناوی خواردنەکە چیە، دواتر کرێکارێک کە لەپاڵ ئەوان نانی دەخوارد پێی وتن ئەم خواردنە ناوی (اللبلابی)یە، هەروەها پێی گوتن: عوسمانیەکان ئەم خواردنەیان هێناوەتە تونس، تاوەکو ببێتە ژەمی سەرەکی سەربازەکانیان لەبەرەکانی جەنگ، لەبەرئەوەی ئەم ژەمە بەهایەکی خۆراکی گەورە لەخۆدەگرێت و، یارمەتی سەربازەکان دەدات لە بەرگەگرتنی سەرماو سەختی سەفەر، دوای ئەوەی کرێکارەکە زانی نیزال و عبدالعزیز خەڵکی فەڵەستین و مەغریبن بە گەرمی چاک وچۆنی لەگەڵ کردن، پێش ئەوەی بەرەو کارەکەی بەڕێبکەوێت، دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز نانخواردنەکەیان تەواوکرد چوون تاوەکو پارەی خواردنەکەیان بدەن، بەڵام ژمێریارەکە پێی گوتن کرێکارە تونسیەکە پێش ئەوەی بڕوات پارەکەی داوە، بەدوایدا گەڕان تاوەکو سوپاسی بکەن بەڵام نەیاندۆزیەوە، بۆیە بە پەنهانی نزای خێرو بەرەکەتیان بۆکرد، پاشان سواری ئۆتۆمبێلەکەیان بونەوە، بۆ ئەوەی ڕێگەکەیان بەرەو دورگەی جەربای تونسی تەواوبکەن.

کەمێک پێش خۆرئاوابون نیزال و عبدالعزیز گەیشتنە دورگەی جەربەی تونسی، ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو شارە بەڕێکەوتن کە تاوەری کەلەسەرەکانی لێ بوو، ئەویش شارێک بوو دەکەوتە باکوری دورگەکەو پێی دەوترا شاری (حومة السوق)، لەوێوە دەستیانکرد بەگەڕان بەدوای بنکەی پۆستەی تونسی سەر بەم شارە، هەرچەندە دۆزیانەوە بەڵام چەند خولەکێک پێش ئەوەی ئەوان بگەن داخرابوو، بۆیە کارەکەیان دواخست بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر، ئۆتۆمبێلەکەیان لەشوێنێکی گشتی وەستانی ئۆتۆمبێل ڕاگرت و بەپێ بەرەو کەناری دەریا بەڕێکەوتن، لەکاتی ڕۆیشتنیان بەرەو کەناری دەریا، نیزال لەناکاو لەبەردەم مۆنۆمێنتێک وەستا.

- ئەمە بورجی کەلەسەرەکانە عبدالعزیز.
- پێم وابوو ئەم بورجە لە کەلەسەر دروستکراووە!
- بۆچونەکەت لە شوێنی خۆی بوو، ئەم تاوەرە لەبنەڕەتدا لە کەلەسەری داگیرکەران دروستکراوە، بەم شێوەیە بۆ ماوەی سێ سەدە بەردەوام بوو، تاوەکو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لەسەردەمی (ئەحمەد بای یەکەم) گۆڕدرا بەم بینا بەردینیە.
- چیرۆکی بورجی کەلەسەرەکان چیە نیزال؟



بورجی کەلەسەرەکان لە دورگەی جەربەی تونسی

- چیرۆکی ئەم بورجە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٦٠ز، لەم ساڵەدا پاپای ڤاتیکان (بیۆسی چوارەم) داوای لە تەواوی وڵاتانی کاسۆلیکی کرد بۆ ڕاگەیاندنی جەنگ بەمەبەستی گێڕانەوەی وڵاتانی باکوری ئەفریقیا کە عوسمانیەکان ئازادیان کردبوو، پاپا توانی کەشتیگەلی ٦ دەوڵەتی ئەوروپی کۆبکاتەوە ئەوانیش بریتی بوون لە: ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی، کۆماری جێنەوا، کۆماری بوندوقیە، دەوڵەتی بابەوی، دۆکی ساڤوای، هەروەها چەتەکانی قدیس یۆحەنا. داگیرکەرە خاچپەرستەکان لەم شوێنە کۆبونەوە کە ئێستا ئێمە لێی وەستاوین لە دورگەی جەربەی تونسی، هەروەها هێزەکانی عوسمانی بەرەو دورگەی جەربە جوڵەیان کرد، بۆ ڕوبەڕوبونەوەی خاچپەرستە داگیرکارەکان، سەرکردەی کەشتیگەلی عوسمانی پێکهاتبوون لە دوو سەرکردەی گەورەی مسوڵمان، یەکێکیان کرواتی بوو ئەوی تریان

یۆنانی، سەرکردەی ئیتالی کلج عەلی لەم جەنگەدا لەژێر فرمانی سەرکردە یۆنانیەکەدا دەجەنگا، جوڵەکانی کلیج عەلی کاریگەری گەورەی هەبوو لە سەرکەوتنی مسوڵمانان لەم جەنگە چارەنوس سازەدا، دوای تێکشکاندنی ئەم هاوپەیمانێتیە خاچپەرستیە گەورەیە، کەلەسەری داگیرکەرەکان کۆکرانەوە لە زەوی جەنگەکە، کەلەسەرەکان لەسەر یەکتری کۆکرانەوە تاوەکو بورجێکی گەورەی دروستکرد کە لە مێژوودا ناسراوە بە (بورجی کەلەسەرەکان)، لەهەمان شوێن کە ئێمە ئێستا لێی وەستاوین لە کەناری دورگەی جەربەی تونسی.

- ئەو دوو سەرکردە ئەوروپیە کێ بوون کە سەرکردایەتی مسوڵمانانیان دەکرد لەم جەنگەدا؟

- سەرکردەی کرواتی (بەیالی پاشا)، کە سەرکردەی گشتی هێزی دەریایی ئیسلامی بوو، بەڵام سەرکردە یۆنانیەکە ناوی (ترغود پاشا) بوو کە فەرمانداری ولایەتی تەرابلس بوو، یەکێک لە سێ ولایەتەکەی باکوری ئەفریقیا بەپێی دابەشکاری عوسمانی.

- ئەم سەرکردە یۆنانیە هەمان کەس بوو کە پێشتر وتت کلیج عەلی ناوی هێنا پێش جەنگی لیبانتۆ کاتێک وتی: کوان ئەوانەی لەگەڵ خیرالدین پاشا و ترغود پاشا دەجەنگان، لەکوێن بۆ قسە ناکەن؟! یاخود کلیج عەلی مەبەستی کەسێکی تر بوو؟

- هەمان کەسە عبدالعزیز، کلیج عەلی یەکێک بوو لەو سەرکردانەی لەگەڵ کەشتیگەلی ئەم سەرکردە یۆنانیە جەنگاون، ئەم دوو سەرکردەیە پەیوەندی توندوتۆڵیان هەبوو.

- چیرۆکی ئەم سەرکردە یۆنانیە مسوڵمانە چیە نیزال؟

- لە سەرچاوە تورکیەکاندا ناوی بە (ترگوت رەیس) (Turgut Reis) هاتووە، هەروەها لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بە (الریس درغوت) یان (درغوث) هاتووە، لە ساڵی ١٤٨٥ز لە گوندێکی باشوری ڕۆژئاوای تورکیا لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست لەدایکبووە، ئەم گوندە لەساڵ ١٩٧٢ز ناونرا (ترگوت رەیس) (Turgutreis) وەکو ڕێزێک بۆ ئەم سەرکردە عوسمانیە، ترغود لە بنەڕەتدا یۆنانیەکی مەسیحی ئەرسەدۆکسیە، لە تەمەنی ١٢ ساڵی تواناکانی دەرکەوتن و سەرنجی سوڵتان قرقرود برا گەورەی سوڵتان سەلیمی یەکەمی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، ترغود لەناو کەشتیگەلی عوسمانی پەروەردەیەکی دەریایی کرا، سەرەتا بووە دەریاوانێکی سادە، پاشان بووە تۆپ هاوێژ، دواتر لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم گوازرایەوە بۆ میسر و لە شاری ئیسکەندەریە چویە پاڵ ڕیزەکانی کەشتیگەلی سەرکردەی مسوڵمانی کرواتی (سنان پاشا)، لەو کاتەوە ترغود بووە دێوەزمەیەکی ترسناک بۆ کەشتیەکانی چەتە خاچپەرستەکان لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی، لە ساڵی ١٥٢٠ز ترغود چووە ڕیزی سەرکردەکانی سەرکردەی مەزنی دەریایی خیرالدین بەربەڕۆسا، ئازایەتی و دڵسۆزی ئەم سەرکردەیە هەر زوو سەرنجی خیرالدینی بەلای خۆیدا ڕاکێشا بۆیە کردیە زاوای خۆی و بەتەواوی پشتی پێدەبەست، بەم شێوەیە ئەم سەرکردە یۆنانیە بووە دەستە ڕاستی خیرالدین بەربەڕۆسا، لەم ماوەیەدا ترغود لە کەشتیگەلی ئیسلامی پیاوی کارە سەختەکان

بوو، لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیەوە بەڕێکەوت بۆ ڕۆژئاوای دەریای سپی بۆ بەژداریکردن لە ئازادکردنی مسوڵمان و جولەکە بێتاوانەکان لە دادگاکانی پشکنینی کاسۆلیکی و توانی لە کەناراوەکانی ئەندەلوس هەزاران کەس ڕزگاربکات، ترغود لەم ماوەیەدا دەیان جەنگی سەرکەوتووی دژی کەشتیگەلی مەسیحی هەریەکە لە شانشیبی بوندوقیە و ناپۆلی و کەشتیگەلی چەتەکانی قدیس یۆحەنا ئەنجامدا، لە ساڵی ١٥٣٨ز ئەوکاتەی جەنگی چارەنووسازی دەریایی بروزە ڕویدا، ترغود پاشا یەکێک بوو لەو سێ سەرکردەیەی کە خیرالدین بەربەڕۆسا پشتی پێدەبەستن لە سەرکردایەتی کردنی هێزی مسوڵمانان لەم جەنگەدا، بەربەڕۆسا سەرکردایەتی کردنی باڵی دواوەی کەشتیگەلی عوسمانی لەم جەنگەدا بە ترغود پاشا سپاردبوو کە ڕاستەوخۆ دوای دڵی سوپا دەهات کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد، بونی ترغود پاشا لەناو سەرکردەکانی ئەم جەنگە کاریگەری گەورەی لە یەکلاکردنەوەی ئەم سەرکەوتنە مێژووییە هەبوو، دوای ئەم جەنگەو لەمیانەی یەکێک لە هێرشەکانی بۆ سەر چەند مەسیحیەکی دوژمن لە یەکێک لە دورگەکانی دەریای سپی بە بەندی کەوتە دەست هێزەکانی کۆماری جێنەوای مەسیحی، پێش ئەوەی ئازادبکرێت لە کردەیەکی تایبەتی هێزی ئیسلامی.

عبدالعزیز بە پەرۆشەوە پرسی:

- چۆن ئەم سەرکردە یۆنانیە ئازادکرا؟

- هەرکە هەواڵی بەندکرانی تورغود پاشا بڵاوبویەوە، سوڵتان سلێمان خۆی هاتە ناو بابەتەکەوە و پێشنیاری بۆ کۆماری جێنەوا

کرد بە ئازادکردنی تورغود پاشا بەرانبەر هەرشتێک کە داوای دەکەن، بەڵام ئەوان ئەم پێشنیارەیان ڕەتکردەوە، بۆیە سوڵتان داوای لەهێزی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی بەربەڕۆسا بۆ دەرچون بەرەو کەناراوەکانی ئیتاڵیا بۆ ئازادکردنی ترغود پاشا لە کردەیەکی تایبەتیدا، بەم شێوەیە کەشتیگەلی ئیسلامی بەرانبەر کەناراوەکانی هەرێمی لیگوریای ئیتالی لەنگەری گرت و، بەربەڕۆسا ڕاستەخۆ داوای ئازادکردنی ترغود پاشای کرد لە حکومەتی جێنەوا و هەڕەشەشی لێکردن ئەگەر ئازادی نەکەن کەناراوەکانی هەرێمەکەیان بە تۆپی عوسمانی تۆپباران دەکات و کەشتیگەلەکەیان بەتەواوی لەناودەبات، بەمەش حکومەتی جێنەوای مەسیحی ڕازیبوو بە ئازادکردنی ترغود پاشا.

- نیزال دوای ئەوە چی بەسەرهات؟
- دوای ئازادکردنی، ئەم سەرکردە ئەوروپیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی کردەوە بە ڕیزەکانی هێزی دەریایی عوسمانی بۆ بەرگریکردن لە مسوڵمانانی باکوری ئەفریقیا، بەدرێژایی چەندان ساڵ، کەشتیەکانی ترغود پاشا لە دەریای سپی بەرپەرچی هێرشی خاچپەرستانیان دەدایەوە و توانی شاری مەهدییەی تونسی ئازادبکات، هەروەها لە ساڵی ١٥٥١ز سوڵتان سلێمانی قانونی بانگیکرد و ئەرکی ئازادکردنی شاری تەرابلوسی لیبیای پێسپارد کە کەوتبووە دەستی چەتەکانی قدیس یۆحەنا، ئەمەش دوای گەیشتنی نامەی هاواری خەڵکی لیبیا بۆ سوڵتانی عوسمانی وەکو خەلیفەی مسوڵمانان، هەروەها سوڵتان سلێمان ئەرکی سەرکردایەتی بەرەی

رشكانی بەخشیە سەرکردەی کرواتی مسوڵمان (سەنان پاشا)، سوڵتان سلێمان لەگەڵ ئەم دوو سەرکردەیە لەسەر پلانێکی جەنگی ڕێکەوتن، بەپێی پلانەکە سەنان پاشا هەڵدەستێت بە هێرشی رشکانی لە ڕۆژهەڵاتەوە کە خۆشی ئەوکاتە والی میسر بوو، هەروەها ترغود پاشا لە باکورەوە هێرشی دەریایی دەکات بە کەشتیگەلی عوسمانی، پێش بەڕێکەوتنی بە کەشتیگەلی عوسمانی بۆ ئەم جەنگە سوڵتان سلێمان قورئانێک و شمشێرێکی نەخشێنراوی بە ترغود پاشا بەخشی و داوای سەرکەوتنی بۆ لە خودای گەورە کرد، بەم شێوەیە ئەم دوو سەرکردە ئەوروپیە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی چەتەکانیان دا و دوای زیاتر لە هەفتەیەک لە ئابلۆقە چەتەکانی قدیس یۆحەنا خۆیان بەدەستەوەدا و شاری تەڕابلوس لە ڕۆژی ١٥-٨-١٥٥١ز ئازادکرا، دوای ئازادکردنی تەڕابلوس سوڵتان سلێمان فرمانێکی دەرکرد بە دامەزراندنی ترغود پاشا وەکو یەکەمین فەرمانڕەوای عوسمانی ئەم شارە کە بوە یەکێک لە سێ ویلایەتی عوسمانی باکوری ئەفریقیا، ترغود پاشا ئەو شوێنانەی چەتەکانی قدیس یۆحەنا وێرانیان کردبوو چاکی کردنەوە، هەروەها چەندان شوێنەواری شارستانیەتی تێدا دروستکرد، تاوەکو ئەمڕۆش مزگەوتی ترغود پاشا کە ئەم سەرکردەیە لەم شارەی لیبیا دروستی کرد ناوی ئەوی هەڵگرتووە.

- دوای ئەوەی بووە فەرمانڕەوای تەڕابلوس، ترغود پاشا وازی لە جەنگی دەریایی هێنا تاوەکو بحەسێتەوە؟

- لەژیاندا کۆمەڵێک مرۆڤی دەگمەن هەن هەمیشە ڕێگا ئەکەن بەبێ وەستان، تەنانەت ئەگەر هەلی باش و فریودەری بۆ بێت تاوەکو بیوەستێنن لە تەواوکردنی ڕێگاکەی، ئەمانە لە ڕاستی ئەم ژیانە تێگەشتوون و دەزانن کە تەنها کارەکانیان لەدوای خۆیان دەمێنێتەوە دوای مەرگیان، ترغود پاشا سەربەم دەستە تایبەتەی مرۆڤ بوو، سەرەڕای ئەوەی حاکمی یەکێک لە ولایەتە گەورەکانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوو، هەروەها سەرەڕای تەمەنە گەورەکەی کە دەگەیشتە ٨٠ ساڵ و سەرەڕای ئەو هەموو برین و ئازار ودیلیەی لە ژیانیدا چەشتبووی، بڕیاریدا مسوڵمانان و دونیا ڕزگاربکات لەدەست خراپەکاریەکانی چەتەکانی قدیس یۆحەنا، بۆیە وازی لە کورسی دەسەڵات هێنا و خۆی لەگەڵ سەرکردەکانی تری کەشتیگەلی دەریایی بەژداری هێرشێکی نیمچە مەحاڵی بەرەو ماڵتا کرد، ماڵتا ئەو دورگەیە بوو کە چەتەکان کردبویانە بنکەی سێیەمیان دوای دەرکردنیان لە بنکەی یەکەمیان لە قودس لەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبی و بنکەی دووەمیان لە دورگەی ڕۆدس لەلایەن سوڵتان سلێمانەوە، کەشتیگەلی عوسمانی لە مایۆی ساڵی ١٥٦٥ز گەیشتە کەناراوەکانی ماڵتا و ئابلۆقەیان خستە سەر چەتەکانی قدیس یۆحەنا و هێزەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ئیسپانی، کە بۆ بەرگریکردن لە دورگەکە هاتبون و ئابلۆقەکە زیاتر لە سێ مانگی خایاند، بەڵام بەهێزی دیواری قەڵاکانی دورگەکە و بەرگری خاچپەرستان ڕێگربوون لە چونەناوەوەی مسوڵمانان بۆ شارەکە، لە ئەنجامی بەرکەوتنی ساچمەی تۆپێکەوە ترغود پاشا شەهیدبوو،

مسوڵمانان بە لەدەستدانی ئەم سەرکردە گەورە یۆنانیە زۆر دڵتەنگ بوون، تاوەکو ئێستاش ئەو شوێنەی ئەم سەرکردەیەی تیادا شەهید بووە ناودەبرێت بە (خاڵی ترغود)(Point Dragut)، لە کاتێکدا ناوی پایتەختی ماڵتا نراوە (ڤالیتا) بەناوی ئەو سەرکردە خاچپەرستیەی کە سەرکردایەتی خاچپەرستانی کردوە لەم جەنگەدا (جان پاریسۆت دی لاڤالیت)( Jean Parisot De Valette).

- نیزال ئایە ترغود پاشا لە ماڵتا نێژرا؟

- نەخێر عبدالعزیز، مسوڵمانان ترسان لەوەی چەتەکان گۆڕەکەی هەڵدەنەوە چونکە بە دوژمنی یەکەمیان دەزانی، بۆیە سەرکردەی ئیتاڵی تەرمی مامۆستاکەی (ترغود پاشا)ی بە کەشتیە تایبەتیەکەی هەڵگرت و گواستیەوە شاری تەڕابلسی لیبی کە پێش چەند ساڵێک ترغود پاشا لەدەست چەتەکان ڕزگاری کردبوو، لەم شارە لیبیە و لە نزیک کەناراوەکانی دەریای سپی ناوەڕاست ناشتیان، کە شەپۆلەکانی دەریا چیرۆکەکانی دەگێڕایەوە لە منداڵیەوە.

- لیبیا دوای کۆچی ئازادکەرەکەی (ترغود پاشا) چی بەسەرهات؟

- دوای ئەوە بە فەرمانی سوڵتان سلێمان، کلیج عەلی فەرمانڕەوای ولایەتی تەڕابلسی گرتەدەست و بەردەوام بوو لە بەهێزکردنی شارەکەو ئامادەکردنی تاوەکو ببێتە بنکەیەکی بەهێز بۆ دەرچونی کەشتیگەلی عوسمانی، تەنانەت سێ ساڵ دوای ئەوە کە

کلیج عەلی بووە فەرماندەی گشتی جەزائیر و سێ ولایەتەکەی باکوری ئەفریقیا، تەرابلس ڕۆڵێکی گەورەی لە هەڵمەتە دەریایەکان دژی داگیرکەران دەگێڕا، بە تێپەڕبونی کات هێزی دەریایی ئیسلامی لە ولایەتی تەڕابلس کۆبووەوە، بۆیە ژمارەیەکی قورس لە هاوکێشەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، بەشێوەیەک کەشتیە ئەوروپیەکان بڕێک پارەیان دەدا بە فەرمانڕەوای تەڕابلس لە بەرانبەر دەستەبەرکردنی سەلامەتیان لە دەریای سپی و تێپەڕبوون بە ئاوەکانی لیبیا، لەگەڵ دامەزراندنی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە کۆتای سەدەی هەژدە، فەرمانڕەوا تازەکانی ئەمریکا سوربوون لەسەرئەوەی پەیوەندی باشیان لەگەڵ ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و فەرمانڕەواکانی لە لیبیا و باکوری ئەفریقیا بە گشتی هەبێت، ئەو کات ئەمریکا ساڵانە بڕێک پارەی دەدا بە دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر دەستەبەرکردنی ڕۆیشتنی کەشتیە بازرگانیەکانی بە ئاوە هەرێمیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە دەریای سپی، لە سەردەمی یەکەمین سەرۆکی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا (جۆرج واشنتۆن) (George Washington) و لە ٤ی ١١ی ساڵی ١٧٩٦ز ڕێکەوتنی (تەڕابلس) (Treaty of Tripoli) واژووکرا، لە نێوان هەریەکە لە ولایەتە یەکگرتوەکان و والی عوسمانی لە تەڕابلس، هەروەها ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی (وەکو دەستەبەر) و والی عوسمانی لە جەزائیر (وەکو لایەنی سێیەم و شاهید) لە ١٧٩٧ز ڕێکەوتنەکەیان واژووکرد، مسوڵمانان سووربوون لەسەرئەوەی کۆپی ئەسڵی ڕێکەوتنەکە بە زمانی عەرەبی بنوسرێت ئەمەش جاری یەکەم

بوو له مێژووی ئەمریکا، بۆیه تاوەکو ئێستاش کۆپی ئەسڵی ڕێکەوتنەکه به زمانی عەرەبی له ئەرشیفی ئەمریکی پارێزراوه، دوای واژووکردنی ئەم ڕێکەوتنه، له لایەن دووەم سەرۆکی ئەمریکا (جۆن ئادەمز) (John Adams) پێشکەشی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا کرا، ئەنجومەنی پیران ڕەزامەنی نواند لەسەر ڕێکەوتنەکه له کۆنگرێسی ئەمریکی له ١٠ی یۆنیۆی ١٧٩٧ز، ئەم ڕێکەوتنه گرنگیەکی گەورەی هەبوو له مێژووی ئەمریکادا، بەتایبەت بەهۆی بونی بەندی یازده له ڕێکەوتنامەکە.

- نیزال، بەندی یازده باسی چی دەکات؟

- ئەمریکیەکان سووربوون لەسەرئەوەی مسوڵمانانی باکوری ئەفریقیا دڵنیابکەنەوه که له مێژوویاندا توشی چەندان هێرشی خاچپەرستی بووبونەوه، بۆیه لەم ڕێکەوتنه ئەمریکیەکان ئەوەیان ڕونکردەوه که ئەوان دوژمنداریەکی مێژووی ئاینیان لەگەڵ مسوڵمانان نیه، بۆیه بۆ یەکەم جار له ڕێکەوتنی تەڕابلس و له بەندی یازده ئەمریکا دانی بەوەدانا که ئەمریکا (وڵاتێکی مەسیحی نیه). بۆیه ئەم ڕێکەوتنه گرنگیەکی گەورەی بەدەستهێنا لای یاساناسانی ئەمریکی، بەتایبەت بەندی یازده که لای یاساناسانی ئەمریکی ناسراوه به (Article ١١)، بەڵگەیەکی یاسایی بوو بۆ هەموو ئەوانەی بانگەشەی ئازادی ئاینی و دەستوەرنەدانی کەنیسەیان دەکرد له کاروباری سیاسی.

- بەتەواوی لەم بەندەدا چی نوسراوه؟

- ئەمە دەقی بەندی یازدەیە لە ڕێکەوتنی تەرابلس لە ساڵی ١٧٩٦ز: ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەهیچ شێوەیەک لە شێوەکان لەسەر بناغەی ئاینی مەسیحی دانەمەزراوە، بۆیە هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ یاسا و ئاین و نەگۆڕەکانی مسوڵمانان نیە، بۆیەش بەژداری هیچ جەنگێک یاخود کارێکی دەست درێژیکارانەی دژی هیچ گەلێکی مسوڵمان نەکردوە، لەبەرئەوە هەردوو لایەن ڕایدەگەیەنن کە بەهۆی جیاوازی ئاینیەوە هیچ پچڕانێک لەنێوان ئەم دوو وڵاتە ڕونادات. (Art. ١١. As the government of the united states of America is not, in any sense, founded on the Christian religion, as it has in itself no character of enmity against the laws, religion, or tranquility, of mussulmen , and, as the united states never entered into any war, or act of history against any mssulmen nation, it is declared by the parties that no pretext arising from religious opinions, shall ever produce an interruption of the harmony existing between the two countries).

بەڵام نیزال سیاسیەکانی ئێستای ئەمریکا ئەم بەندە دەزانن کە باوباپیرانیان لە دامەزرێنەرانی ئەمریکا نوسیویانە، کە پێویستە پەیوەندی ئەمریکا و جیهانی ئیسلامی لەسەر ئەو بنچینەیە بێت؟

نازانم، ئایە هەموو سیاسیەکانی ئەمریکا ئەم بەندەیان بیستوە، بەڵام لەبیرمە سەرۆکی پێشوی ئەمریکی (باراک ئۆباما) باسی ئەم بەندەی کرد، لەو وتارەی لە ساڵی ۲۰۰۹ز لە زانکۆی قاهیرە پێشکەشی جیهانی ئیسلامی کرد، کە تێیدا باسی ڕێکەوتنامەی تەرابلسی کرد و بەندی یازدەی وەکو بەڵگە هێنایەوە لەسەر ئەوەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ مسوڵمانان یاخود ئاینەکەیان نییە.

❊❊❊

## نهێنی ژمارە ٤٢٠

دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز لە گەڕان بەنێو شوێنەوارە مێژوییەکانی دورگەی جەربە تەواوبون، بەدوای هۆتێلێک تاوەکو شەو تیایدا بمێننەوە گەڕان، بەڵام تەواوی هۆتێلەکانی دورگەکە پێشتر گیرابوون، دوای گەڕانێکی زۆر لە هۆتێلەکانی شارەکە، هۆتێلێکی دووریان دۆزیەوە کە دەکرا شەو تێیدا بمێننەوە.

- سڵاو، دەمانەوێت ژوورێکی دوو کەسی بەکرێ بگرین. نیزال بە کارمەندی پێشوازی هۆتێلەکەی گوت.

- سـلاو گەورەم، بەداخەوە تەواوی ژورە دوو کەسیەکان بەکرێگیراون، چونکە ئێستا لوتکەی وەرزی گەشتیارییە، بەلام دوو ژووری یەک کەسیمان هەیە لەپاڵ یەک لە نهۆمی چوارەم.

- باشە، کەواتە ئەو دوو ژورەمان دەوێت بۆ تەنها شەوێک.

- بەسەرچاو، ئێوە پاسپۆرتەکانتان لێرە جێبێڵن، من کارەکانی ترتان بۆ تەواو دەکەم و هاوکارەکەم ڕێنمونیتان دەکات بۆ ژورەکانتان.

کارمەندی پێشوازی بانگی یەکێک لە کارمەندەکانی کرد تا یاوەری نیزال و عبدالعزیز بکات بۆ ژوورەکانیان، شتێک سەرنجی نیزالی ڕاکێشا، بۆیە دوای نیو کاتژمێر لە دابڕانیان و چونی هەریەکە لەدوو هاوڕێکە بۆ ژوورەکانیان، عبدالعزیز گوێی لە دەنگی نیزال بوو لەدەرگای دەدا و ئەمیش دەرگاکەی بۆکردەوەو پێی گوت:

- هاوڕێی خۆشەویستم نیزال، دەزانم تۆ تاوەکو کاتژمێر سێی شەو ناخەوی، بەلام دەبێت پێت بڵێم من بەهۆی گەشتەکەمانەوە زۆر ماندووم، دەمەوێت کەمێک پشوو بدەم پێش ئەوەی بەیانی بچین بۆ نوسینگەی پۆستە.

- نیزال بە پەرۆشەوە وتی: دۆزیمەوە عبدالعزیز، نهێنم ژمارە (٤٢٠)م دۆزیەوە!

- مەبەستت ژمارەی دووەمە کە لە خـوارەوەی نهێنی بەربەرۆسا هەیە؟

- بەڵێ هاوڕێ، ئەو ژمارەیەی لەناو سێگۆشەی ئاگادارکردنەوە هەیە.

- ئەم ژمارەیە هێمایە بۆچی؟ چۆن واتای ئەم ژمارەیەت دۆزیەوە لەم کاتە درەنگەی شەودا؟

- کاتێک خزمەتگوزاری هۆتێلەکە ئێمەی گەیاندە ژوورەکانمان، وەکو کارمەندی پێشوازی پێی ڕاگەیاندبوین ژورەکانمان لەپاڵ یەکتریەوەیە، تێبینی ئەوەم کرد ژمارەی ژوورەکان بریتین لە (٤١٩) و (٤٢١) ئەم ژمارانە توشی سەرسوڕمانیان کردم، چۆن دەبێت دوو ژووری پاڵ یەکتری دوو ژمارەی پاڵ یەکتری هەڵنەگرن؟ ڕۆیشتم بۆ ڕاڕەوەکە تاوەکو بەدوای ژووری ژمارە (٤٢٠) بگەڕێم، بەڵام نەمدۆزیەوە، لە یەکێک لە پاککەرەوەکانم پرسی لە شوێنی ژووری ژمارە (٤٢٠)، پاککەرەوەکە پێکەنی و پێی گوتم: ژووریان بەو ژمارەیە نییە لەم هۆتێلەدا، دوای ئەوەی هۆکاری نەبونی ئەو ژورەی پێگوتم لە هۆتێلەکەیاندا، گەڕانێکی خێرام کرد لە ئینتەرنێتدا تاوەکو واتای ژمارە (٤٢٠) بدۆزمەوە!

- ئەم ژمارەیە واتای چیە نیزال؟ ئایە هیچ پەیوەندیەکی بە کۆماری چیکەوە هەیە کە کۆدە نێودەوڵەتیەکەی بەم ژمارەیە دەستپێدەکات؟

- بەهیچ شێوەیەک عبدالعزیز، بە پێچەوانەی ژمارەکەی تری ئاگادارکردنەوە کە ئاماژەی دەکرد بە کۆدی نێودەوڵەتی مالْتا وەکو هێمایەک بۆ چەتەکانی قدیس یۆحەنا، ئەم ژمارەیە لە نهێنی بەریەڕۆسا لە نزیک و دوورەوە پەیوەندی بە چیکەوە نیە، بەڵکو هێمایە بۆ شتێکی تر، هێمایە بۆ حەشیش!

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسی: مەبەستت لە حەشیش هەمان مادەیە کە ئێمە لە مەغریب پێی دەڵێین (الكيف)؟!

- بەڵێ مەبەستم ئەوەیە هاوڕێ، مەبەستم مادەی بێهۆشکەری حەشیش یاخود (ماریجوانا) یە، کە یەکێکە لەبەناوبانگترین جۆرەکانی مادەی بێهۆشکەر لە جیهاندا.

- بەڵام نیزال پەیوەندی حەشیش چیە بە ژمارە (٤٢٠)؟




- ئەم ژمارەیە لەلایەن ئالودەبوانی ئەم مادەیەوە لەسەر ئاستی جیهان پشتی پێدەبەسترێت، چیرۆکی پەیوەندی ئەم ژمارەیە بە مادەی حەشیش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، بە دیاریکراوی ساڵی ١٩٧١ز لە ولایەتی کالیفۆرنیای ئەمریکی، هەندێک قوتابی یەکێک لە قوتابخانەکانی ئەم ویلایەتە کە پێی دەوترا قوتابخانەی (ئامادەیی سان رافایل) ( San Rafael High School) هەموو ڕۆژێک لای یەکێک لە پەیکەرەکان کۆدەبونەوە بۆ کێشانی حەشیش، ڕێککەوتن کە کاتژمێر ٤:٢٠ی هەموو عەسرێک کاتی دیاریکراوی کۆبونەوەیان بێت لای هەمان

پەیکەر بۆ ئەوەی بەیەکەوە حەشیش بکێشن، بەمەش ژمارە ٤٢٠ بوە کۆدێکی نهێنی نێوانیان، دوای ئەوە، ئەم ژمارەیە بەشێوەیەکی فراوان لای ئالودەبوانی حەشیش بڵاوبویەوە وەکو ئاماژەیەک بۆ ئەم مادەیە کە کۆئەندامی دەمار وێراندەکات، بۆیە حەشیش کێشەکان هەموو ساڵێک لە هەندێک وڵات لە ٢٠ی مانگی ٤ خۆپیشاندانیان دەکرد و داوایان دەکرد رێ بەکێشانی ئەم مادە بێهۆشکەرە بدرێت، بۆیە حەشیش کێشەکان ژووری ژمارە (٤٢٠)ی هۆتێلەکانیان هەڵدەبژارد تاوەکو بەکۆمەڵ حەشیشی تێدا بکێشن، ئەمەش زۆرێک لە هۆتێلەکانی لە جیهان ناچارکرد ژمارە (٤٢٠) بە هیچ ژوورێک نەدەن لە هۆتێلەکانیان، ئەمەش نهێنی نەبونی ژووری ژمارە (٤٢٠)ە لەم هۆتێلە هاورێ.

- مەبەستت ئەوەیە نیزال کە دانەری نهێنی بەربەرۆسا لە رێکخراوێکی تری مەترسیدار ئاگاداری کردوینەتەوە کە پەیوەندی بە بازرگانی حەشیش هەیە لە جیهاندا؟

- نەخێر مەبەستم ئەوە نیە عبدالعزیز.

- کەواتە مەبەستت چیە؟!

- پێم وایە نهێنی بەربەرۆسا ئاماژەدەکات بەیەکێک لە مەترسیدارترین رێکخراوەکان لە مێژووی جیهاندا، ئەویش رێکخراوی (حەشاشیەکان) (الحشاشين)ە!

***

# قەلای (ئالْمۆت)

عبدالعزیز پرسی:

- چیرۆکی ئەم ڕێکخراوە ترسناکە چیە نیزال؟ بۆچی لە ترسناکترین ڕێکخراوە تاوانکاریەکانە کە لە مێژوو دەرکەوتون؟

- هاوڕێ مێژووی ئەم ڕێکخراوە بۆ سەدان ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، کەمێک پیش دەرکەوتنی جەنگە خاچپەرستیەکان، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە نهێنیە بە تیرۆرکردنی هەرکەسێک رادەسپێردران کە لە دژیان بوەستێت، حەشاشیەکان لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر یەکێک لە گروپە شیعیەکان، ئەویش گروپی (ئیسماعیلی نزاری)یە، ئەم گروپە شیعیە لە عوبەیدیەکان (فاتمیەکان) جیابونەوە کە ئەوانیش بەشێکن لە شیعەی ئیسماعیلی، ئەمەش لە کۆتایەکانی سەدەی پێنجی کۆچی و یازدەی زاینی، ئەم گرپە باوەڕیان وایە واتاکانی قورئان واتایەکی (پەنهان، باطني) یان هەیە، کە جیاوازە لە واتا دیارو ئاشکراکەی، بۆیە تەفسیری نامۆیان بۆ زاراوەکانی قورئان هەیە کە زیاتر لە وشەی نهێنی دەچن و لەلایەن شێخی ئەم گروپەوە دیاریدەکرێن.

- ئەم گروپە چۆن دامەزرا نیزال؟

- دامەزراندنی ئەم گروپە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە ترسناکترین تاوانبارەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، ئەو کەسەش پێی دەوترێت (حسن سەباح)، لە سەرەتادا حسن سەباح یەکێک لە قەلا

تۆکمەکان کە ئێستا دەکەوێتە وڵاتی ئێرانی کردە بارەگای نهێنی بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازە باتنیەکەی.



ئەم قەڵایە دەکەوێتە ناوەڕاستی چیای ئەلبورز یاخود دەیلم لە باشوری دەریاچەی قەزوین و نزیکەی ۱۰۰ کم لە تارانی پایتەختەوە دوورە، ئەم قەڵایە سەختە ناوی (قەڵای ئالمۆت)( Alamut Castle)ە، کە بە فارسی بەواتای (هێلانەی هەڵۆ) دێت، حسن سەباح دەستی بەسەر ئەم قەڵایەدا گرت و کردیە بنکەی ڕاهێنانی شوێنکەوتوانی کەبەهۆی مادەی حەشیش بەسەریاندا زاڵ دەبوو، بۆیە پێیان دەگوترێت: حەشاشیەکان، کاری ئەندامانی ئەم گروپە تیرۆرکردنی لەناکاو بوو، نەوەک ڕوبەڕوبونەوە، بۆیە وشەی (تیرۆرکردن) لە زۆربەی زمانە بیانیەکان لە وشەی (حەشاشیەکان) وەرگیراوە، بۆیە لە زمانی ئینگلیزی پیاوکوژی شارەزا کە خەڵکی

تیرۆردەکات پێی دەوترێت (Assassin) هەروەها کاری کوشتن بەنهێنی پێی دەوترێت (Assassinate).

- حەسەن سەباح چۆن بەسەر شوێنکەوتوانی زاڵ دەبوو؟
- گەشتیاری بەناوبانگی ئیتاڵی (مارکۆ پۆلۆ) (Marco Polo) کە لە کۆتایی سەدەی سێزدە و سەرەتای سەدەی چواردە بە وڵاتانی ئاسیادا گەڕاوە، چیرۆکێکی مەترسیدارمان لەبارەی ڕێکخراوی حەشاشیەکان بۆ دەگێڕێتەوە، کە چۆن سەرکردەکەیان کە ناویان ناوە (شیخ الجبل) زاڵ بووە بەسەریان، مارکۆ بەم شێوەیە باسی بنکەی حەشاشیەکان دەکات کە بە قەڵای ئالْمۆت بەناوبانگ بووە: ((باخچەیەکی گەورەی تێدایە کە پڕە لە میوەجات، هەروەها کۆشک و کانیاوی تێدایە کە پڕە لە شیر و هەنگوین و ئاو و شەڕاب، هەروەها کچانی جوان گۆرانی دەڵێن و سەمادەکەن و مۆسیقا دەژەنن، شیخ الجبل وا لە شوێنکەوتوانی دەگەیەنێت کە ئەم کۆشکە بەهەشتە، قەدەغەیە کەس بچێتە ناوی، تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن بچنە ناوی کە بڕیاردەدەن بچنە ڕیزی حەشاشیەکان، شیخ الجبل دەیانباتە ناو قەڵاکەوە بەشێوەی گروپ، پاشان حەشیشیان پێدەدات، پاشان لێیان دەگەڕێت بخەون، پاشان فرمان دەکات کە ئەو کەسە هەڵبگرن و بیخەنە ناو باخەکەوە، پاشان کە بێداردەبنەوە وا بیردەکەنەوە کە چونەتە بەهەشت، پاشان کە ئارەزووەکانیان تێردەکەن و خۆشی وەردەگرن، جارێکی تر حەشیشیان پێدەدرێت و بێهۆش دەکرێن، پاشان لە باخەکە دەردەهێنرێن و دەبرێنە لای شیخ الجبل و لە بەرانبەری دەچەمێنەوە، ئەویش پرسیاریان لێدەکات لە

کوێوە هاتوون؟ ئەوانیش وەڵامدەدەنەوە: لە بەهەشتەوە، دوای ئەوە شیخ الجبل دەیاننێرێت بۆ کوشتنی کەسانی دیاریکراو و بەڵێنیان پێدەدات ئەگەر لە کارەکانیان سەرکەوتوو بن جارێکیتر دەیانگەڕێنێتەوە بۆ بەهەشت، ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەشیان بکوژرێن فریشتە هەڵیاندەگرن و دەیان بەن بۆ بەهەشت)).

بەم شێوەیە سەرکردەی حەشاشیەکان توانیویەتی بەسەر شوێنکەوتوانی زاڵب بێت و بیانکاتە ئامێرێکی مرۆڤکوژی ترسناک، بەشێوەیەک ئەگەر فرمانی بە یەکێک بکردایە خۆی بکوژێت ئەم کارەی دەکرد، بەم شێوەیە حەشاشیەکان بەم دەستە مرۆڤکوژە ترسناکە دەیانتوانی هەرکەسێک بکوژن کە ببێتە بەربەستی بەردەمیان، لە مسوڵمان و نامسوڵمان، چەندین کەسایەتی گەورەی مسوڵمان بونە قوربانی دەستی ئەم گروپە، یەکەم قوربانیشیان وەزیری فارسی دەوڵەتی سەلجوقی (نظام الملک الطوسي) بوو، کە بەیەکێک لە باشترین وەزیرەکانی مێژووی ئیسلامی دادەنرێت، پاشان چەندین کەسایەتی تری بەدواداهات، زۆرێک لەم بکوژانەش دوای ئەنجامدانی کارەکەیان بەسەرکەوتویی خۆیان دەکوشت، بەم شێوەیە چەندان کەسی گەورەیان شەهیدکرد، گەورەتریشیان خەلیفەی عەباسی (المسترشد) بوو، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە توانیبویان شۆڕببنەوە ناو پایەکانی حوکم، تەنانەت یەکێک لە پاسەوانە تایبەتیەکانی سەرکردەی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی) سەر بەم ڕێکخراوە نهێنیە بوو، هەروەها حەشاشیەکان چەندین سەرکردەی خاچپەرستیشیان تیرۆرکرد، لێرەوە ئەورووپا وشەی

(Assassin)یان بەکارهێنا بەواتای کردەوەی بکوژی و تیرۆری نهێنی.

- ئەمە واتـــای ئەوەیە کە ڕێکخـــراوی حەشاشـــیەکان دووەم لایەنە کە بەدوای نهێنی بەربەڕۆسادا دەگەڕێت؟

- لە ناوەڕاســـتی ســـەدەی ســـێزدەی زاینـــی ڕێکخـــراوی حەشاشـیەکان لەگەڵ وێرانکردنـــی بنکەکەیـــان لە لایەن ســەرکردەی مەغۆلی (هۆلاکۆ خان) کۆتایان پێهات، پێش داگیرکردنی بەغداد لە ساڵی ١٢٥٦ز، هۆلاکـۆ قەڵای ئـاڵمۆتی وێرانکـرد و حەشاشـیەکان بڵاوبـونەوە، لە سـاڵی ٢٠٠٤ یـش ئەو دیـوارانەی قەڵاکە کە مـابوون بەهۆی ئەو بومەلەرزەیەی لەو ساڵە لە ئێـران رویـدا کەوتـن، ئەوەی من لێـی ئەترسـم عبـدالعزیز ئەوەیە لەگەڵ دارمـانی یەکجاری قەڵای حەشاشیەکان لە بومەلەرزەی ئەم دوایەی ئێران ئەم بیرە توندڕەویە تـازەببێتەوە و شـوێنکەوتوانی ئەم بیـرە بـاتنیە دووبـارە خۆیـان ڕێکبخەنەوە لەژێر ناوی (حەشاشـیە نوێکـان) وەکـو چۆن نازیەکان لەم دوایە لە ئەوروپا خۆیان ڕێکخستەوە بەناوی (نازیە نوێکان).

- ئەوەی تۆ دەیڵێی نیزال، وام لێدەکات بیـر لە هێمای (دوو بەندە بکوژەکە) بکەمەوە لە چیرۆکی کوشتنی زیر سالم کە لە نهێنی بەربەڕۆسادا هاتوە، ڕێکخراوی چەتەکانی قدیس یۆحەنا و ڕێکخراوی حەشاشیەکان لەیەکتری دەچـن لە شـوێنکەوتنی کوشـتنی ڕێکخراو، هەروەهـا ئەنـدامانی ئەم دوو ڕێکخـراوە وەکـو کـۆیلە وان، فرمـانی گەورەکانیـــــان بـــــێ بیرکـــــردنەوە جێبەجـــــێ دەکەن.

—زۆر باشە عبدالعزیز، وادیارە تۆ ئێستا لە تێگەیشتنی واتای زۆرێک

له هێما نهێنییەکان لەمن شارەزاتری، لێکدانەوەکەت ژیرانەیە،
پیرۆزبایت لێدەکەم.
عبدالعزیز بە زەردەخەنەوە گوتی:
- ئەوەی لەم چەند ڕۆژە کەمە بینیمان نیزال، بەسە بۆ ئەوەی هەرکەسێک ببێتە شارەزا لە لێکدانەوەی زمانی هێماکان.
- ئێستا کاتی ئەوەیە جێت بهێڵم تاوەکو کەمێک پشوو بدەی، بەیانی ڕۆژێکی درێژمان لەپێشە، شەوشاد هاوڕێ.
- شەوشاد نیزال، هیوادارم ئەگەر ئەم شەو شتێکی تازەت لە نهێنی بەربەڕۆسا دۆزیەوە، لای خۆت بیپارێزی تا بەیانی، چونکە جارێکی تر دەرگات لێناکەمەوە! عبدالعزیز بەزەردەخەنەوە بەم وشانە ماڵئاوایی لە نیزال کرد، ئەویش چوە ژورەکەی تاوەکو بخەوێت.

## چەتەکانی کاریبی

دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز نانی بەیانیان لە هۆتێل خوارد، بەپەلە بەرەو نوسینگەی پۆستەی تونسی بەڕێکەوتن کە دەکەوتە ناوچەی (حومة السوق) لە دورگەی جەربە، نیزال کارتی پۆستە ئەلیکترۆنیەکەی کە لە سندوقەکەی جەزەری دۆزیەوە، پیشانی کارمەندی پێشوازی دا و کارمەندی پێشوازیش نیزال و عبدالعزیزی ڕێنمایی کرد بۆ ئەو ژوورەی سندوقەکانی پۆستەی ئەلیکترۆنی تیادا دانرابوو، دوای چەند ساتێک گەڕان، عبدالعزیز سندوقی پۆستەی

ژمارە ١٠١ی دۆزیەوە و نیزال بەخێرایی کارتە ئەلیکترۆنیەکەی لە شوێنی دیاریکراودا دانا.

- سندوقەکە ناکرێتەوە عبدالعزیز، لەوانەیە کێشەیەک لە سندوقەکە هەبێت، بێزەحمەت کارمەندەکە بانگ بکە تاوەکو کێشەکە چارەسەربکات.

عبدالعزیز چەند ساتێک ون بوو پاشان بەیاوەری کارمەندەکە گەڕایەوە

- فەرموو گەورەم، کێشەیەکتان هەبوو؟

- کارتە ئەلیکترۆنیەکەم لە سندوقی پۆستەی تایبەتی خۆی داناوە بەڵام سندوقەکە ناکرێتەوە!

- گەورەم، دوای ئەوەی کارتە ئەلیکترۆنیەکەت لە شوێنی خۆی دانا دەبێت ژمارەی نهێنیش لێبدەی.

- ژمارەی نهێنی، مەبەستت کام ژمارەیە؟

- ئەو ژمارە نهێنیەی لە ٢١ ژمارە پێکهاتووەو دوای بەکرێگرتنی سندوقەکە ڕاستەوخۆ دایدەنێی گەورەم.

نیزال بە پێکەنینەوە بە کارمەندەکەی گوت:

- بەڵێ بەڵێ، بیرم کەوتەوە، سوپاس بۆ یارمەتیدانت.

کارمەندەکە نیزال و عبدالعزیزی بەجێهێشت و ئەوانیش بەبێدەنگی وەستابوون.

- نیزال، با حەوت ژمارەکەی دوای ژمارە ١١٠ تاقیبکەینەوە، هەریەکەیان لە سێ ژمارە پێکدێت و کۆی گشتیان دەکاتە ٢١ ژمارە.

بیرم لەوە کردبووەوە، بەڵام هەر هەوڵێکی هەڵە زەنگی ئاگادارکردنەوەی تایبەت بەم سندوقانە کارادەکات، پاشان بەتۆمەتی دزینی ئەم کارتە ئەلیکترۆنیە دەکەوینە زیندان، ئێمەش بەڵگەنامەیەکمان نیە کە بیسەلمێنێت ئێمە ئەم سندوقەمان بەکرێ گرتووە، تێبینی ئەوەم کرد پرسیارەکەمان دەربارەی سندوقەکە لە کارمەندەکە گومانی لای کارمەندی پێشوازی دروستکرد، گەر سەیری دواوەی خۆت بکەی دەبینی لەگەڵ یەکێک لە پاسەوانەکان قسە دەکات و سەیرمان دەکات، پێم وایە باشترە ئێرە جێبهێڵین بە بەهانەی گەڕانەوەمان بۆ هۆتێلەکەمان بۆ هێنانی ژمارە نهێنیەکە، ئەوکات دەتوانین بە ئارامی لەبارەی ئەم ژمارانە بیربکەینەوە.

- کارەکە زۆر لەوە ئاسانترە نیزال، پێویست بە ترس ناکات، با ژمارەکان دابگرین و بزانین چی ڕوودەدات، لە خراپترین حاڵەت دەتوانین پێیان بڵێین کەسێک ڕاسپاردەیەکی لەناو ئەم سندوقە بۆ جێهێشتوین و کارتە ئەلیکترۆنیەکەشی پێداوین تاوەکو سندوقەکە بکەینەوەو ڕاسپاردەکە ببەین.

عبدالعزیز چاوەڕوانی ڕای نیزالی نەکردو دووبارە کارتە ئەلیکترۆنیەکەی داناوەو پاشان ئەم ژمارانەی لێدا: ١١١١١٢١١٣١١٤١١٥١١٦١١٧ڕاستەوخۆ سندوقەکە کرایەوە.

نیزال، عبدالعزیزی لە باوەش گرت و گوتی:

- ئافەرین عبدالعزیز، بەخیلیت پێدەبەم لەسەر بوێری و چاونەترسیت لەکاتی بڕیاردان، پێموایە پێویستم بە دڵێکی ئازا هەیە وەکو دڵەکەی تۆ.

- نیزال هەندێک جار شتەکان زۆر ڕونن لە بەردەممان، بەڵام ترس ڕێگر دەبێت لە بەردەممان لە بڕیاردانی پێویست لە کاتی گونجاو، ترس سنور بۆ ئازادی و جوڵەو بیرکردنەوەی مرۆڤ دادەنێت، ترسە ناوەکیەکانمان وامان لێدەکات بیر لە خەیاڵ و ڕازی وابکەینەوە کە لەڕاستیدا بوونیان نیە، هەرکات نیەتی کارێکی خێرت هێنا، سەرەتا لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانەی شتەکە بکە بە دوور لەو خەیاڵانەی کە لە ئەنجامی ترسەوە بۆمان پەیدادەبێت، پاشان پشت بەخوا ببەستە، بشزانە هیچ شتێکت توش نابێت مەگەر ئەوەی خودا بۆی نوسیوی.

- سوپاس بۆ ئامۆژگاریەکانت هاوڕێ، سەرسامم بە تێڕوانینە سادەکەت بۆ ژیان.

دوای کردنەوەی سندوقە پۆستەییەکە، نیزال و عبدالعزیز نامەیەکی گەورەی پۆستەیان دۆزیەوە، نیزال نامە پۆستەکەی هەڵگرت و خستیە ناو جانتاکەی بەبێ ئەوەی بیکاتەوە، پاشان لە پۆستەخانەکە بەبەردەم کارمەندی پێشوازی هاتنەدەرەوە و بە زەردەخەنەوەماڵئاوایان لێکرد، دوای ئەوەی دوو هاوڕێکە گەیشتنەوە هۆتێلەکەیان، پۆستەکەیان کردەوە، لە ناویدا وێنەی کەلەسەرێکی مرۆڤی تێدابوو کە لەسەرەوەی ژمارە ١١٨ نوسرابوو.

- ئەمە چیە نیزال؟ تەنها وێنەی کەلەسەرێکە!

- عبدالعزیز ئەم کەلەسەرە هێمای یەکێک لە بەناوبانگترین فیلمە ئەمریکیەکانە، کۆمپانیای دیزنی لەم ساڵانەی دوایی بەرهەمی

هێنا، ئەمە هێمای فیلمی (چەتەکانی کاریبی) (Pirates of the Caribbean)ە.




- هەمیشە ڕێکلامەکانی ئەم فیلمەم لە شەقامەکانی لەندەن دەبینی، بەڵام پەیوەندی ئەم فیلمە چیە بە نهێنی بەربەڕۆسا؟
- ڕۆڵی سەرەکی ئەم فیلمە بەناوبانگە لەلایەن ئەکتەری ناوداری ئەمریکی (جۆنی دیب) بینراوە لە ڕۆڵی کەسایەتی چەتەی ئینگلیزی (کاپتن جاک سپارۆ) (Captain Jack Sparrow)، ئەم ئەکتەرە بەهۆی ئەم ڕۆڵەی ناوبانگێکی جیهانی بەدەستهێنا، هەروەها بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی ئۆسکار پاڵێورا بۆ باشترین ئەکتەری ڕۆڵی سەرەکی لەم فیلمەدا، بەڵام ئەو ڕاستیەی دەیان ملیۆن لە لایەنگرانی ئەم فیلمە نایزانن ئەوەیە کەسایەتی ئەم چەتەیە لە کەسایەتیەکی ڕاستەقینەی یەکێک لە پاڵەوانەکانی هێزی دەریایی ئیسلامی وەرگیراوە، ئەم سەرکردە دەریاوانە ئینگلیزیە مسوڵمانە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەی زاینی کۆچی کرد بۆ تونس.

عبدالعزیز بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- سەرکردەیەکی مسوڵمان لە بنەڕەت ئینگلیزی!

- ناوی ڕاستەقینەی ئەم سەرکردەیە (جاک وارد) (Jack Ward) یاخود (جۆن وارد) (John Ward)ە، هەندێکیش پێی دەڵێن (جۆن بێردی) (John Birdy) لەبەر خۆشەویستی زۆری بۆ باڵندە.

- ئایە خۆشەویستی ئەم سەرکردەیە بۆ باڵندە پاڵی بە کۆمپانیای دیزنی ئەمریکی بەرهەمهێنەری ئەم فیلمە ناوە، وشەی (Sparrow) واتە چۆلەکە بۆ پاڵەوانی فیلمی چەتەکانی کاریبی زیادبکەن؟

- بەدڵنیایەوە، وەکو دەزانی وشەی (Sparrow) لە زمانی ئینگلیزیدا بە واتای چۆلەکە دێت، لە جیاتی وشەی (Birdy) بەکارهاتووە، کە لە وشەی (Bird) واتە باڵندە وەرگیراوە.

- چیرۆکی ئەم دەریاوانە مسوڵمانە ئینگلیزە چییە؟ چۆن چوو بۆ تونس؟

- جاک وارد لە ساڵی ١٥٥٣ز لە شاری (فاڤرشام) (Faversham) کە دەکەوێتە هەرێمی کێنت (Kent) لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئینگلتەرا لەدایکبووە، لەسەرەتای ژیانی ڕاوەماسی کردووە، دوای شکستی گەورەی ئیسپانیەکان لە جەنگی بەناوبانگی (ئەرمادا)، لەو هەڵمەتەیان بۆ داگیرکردنی ئینگلتەرا، ساڵی ١٥٨٨ز لەسەر داواکاری فەرمی شاژنی ئینگلتەرا (ئیلیزابێسی یەکەم) (Queen of England Elizabeth

(جاک وارد لەگەڵ ژمارەیەک لە دەریاوانە ئینگلیزیەکان هێرشیان دەکردە سەر کەشتیە ئیسپانیەکان، ، لەم کاتەدا دوژمنایەتی ئینگلتەرا و ئیسپانیا لەوپەڕی توندی دابوو بەهۆی گۆڕانی ئینگلتەرا لە کاسۆلیکیەوە بۆ پرۆتستانتی، بەم هۆیەوە پاپای ڤاتیکان بە ئاشکرا جەنگی دژی شاژنی ئینگلتەرا ئیلیزابێسی یەکەم ڕاگەیاند و پاپا، شاژنی بە فەرمانرەوایەکی ناشەرعی لە قەڵەم دا و داوای لە شوێنکەوتوانی کرد خۆیان لە گوێڕایەڵی شاژن دابڕنن، بەم هۆیەوە شاژنی ئینگلتەرا ڕووبەڕووی دەیان پلان بویەوە بۆ کۆتایی هێنان بە ژیانی، ئیسپانیا سەرکردایەتی ئەم هەڵمەتە کاسۆلیکیەی دەکرد بۆ لەناوبردنی شاژن و دووبارە گێڕانەوەی ئینگلتەرا بۆ کاسۆلیکی، لەهەمان کاتدا ئیسپانیا هەستا بە سزادان و لەناوبردنی پرۆتستانتەکانی ئیسپانیا و ئەو وڵاتە ئەوروپیانەی لەژێر داگیرکاری ئەودابوون، بە تێپەڕبوونی کات ئەم دەریاوانە ئینگلیزە لەو سەرکردانەبوو کە زیانی گەورەی لە هێزەکانی ئیسپانیا دا و بەهۆی ئەو سامانەی دەستی بەسەردا دەگرت بووە خاوەن سامانێکی زۆر.

- کەواتە بۆچی جاک وارد لە ئینگلتەرا کۆچی کرد، لەکاتێکدا بارودۆخی زۆر باشبوو؟

- کارەکە گۆڕانکاری بەسەردا هات دوای کۆچی دوایی شاژن ئیلیزابێسی یەکەم و گرتنە دەستی دەسەڵاتی ئینگلتەرا لەلایەن (شا جەیمسی یەکەم) (James I of England)، لە ساڵی ١٦٠٢ز ئیسپانیا و ئینگلتەرا ڕێکەوتنی ئاشتیان مۆرکرد، ئەم ڕێکەوتنەش جاک وارد و ژمارەیەک لە دەریاوانە ئینگلیزی و

ئەوروپییەکانی بێبەش کرد لە جەنگی دوژمنە ئیسپانیەکانیان، بۆیە زۆرێکیان بۆ وڵاتە مسوڵمانەکانی باکوری ئەفریقیا پەڕینەوە، کە بە بەردەوامی توشی هێرشی ئیسپان و تێکڕای شانشینە کاسۆلیکەکانی تــر دەبــوون، ئەم دەریاوانــانە لەگەڵ مســوڵمانان لە جەنــگ دژی ئیسپانیەکان بەژداربوون، دوای تـێکەڵ بـوون و بەریەککەوتن لەگەڵ مسوڵمانان زۆرێـک لەم دەریاوانـانە مسـوڵمان بـوون، جـاک واردیش یەکێک بوو لەو سەرکردە ئینگلیزیانەی مسوڵمان بوو، ئەم سـەرکردە ئینگلیزیە مسوڵمانە توانی دەیان شکستی دەریایی بە هێزی ئیسپان وهاوپەیمانەکانی بهێنێت، بۆیە وێنەی جـاک وارد لە خـەیاڵی تـاکی ئەوروپــی پەیوەســـتە بە چەتەگەریەوە، بەتــایبەت کە بەپێــی تێگەیشتنی مەسیحی ئەو کەسێکی هەڵگەڕاوە بوو لە دینەکەی دوای مســـوڵمانبونی، نوســـەری شـــانۆی ئینگلیـــزی (ڕۆبـــرت دابـرۆن) (Robert Dabrone) لە سـاڵی ١٦١٢ز شـانۆگەریەکی لەسـەر جـاک وارد بەنـاوی (مەسـیحیەک دەبێـتە تـورک) ( A Christian Turned Turk)نووسـی، لە تێگەیشتنی خەڵکی ئەوروپا لەو کاتەدا وشەی تورکی بەواتای مسوڵمان دەهـات، تـاوەکو ئەمرۆش زۆرێک لە خەڵکی ئەوروپا و ئەمریکای لاتین مسـوڵمانان بە تورک بانگ دەکەن.

- ڕاستە، هاوڕێیەکی ئەرجەنتینیم هەیە پێی گوتم: یەکێک لە بـاپیرانی لە بنەڕەتـدا تـورکی بـووە، کاتێـک زیـاتر پرسـیارم لێکرد دەربارەی بـاپیری، تێگەیشتم بـاپیرەکەی عەرەب بـووە، نیزال پێم

بڵێ پەیوەندی جاک وارد و وێنەی ڕێکلامی ئەم فیلمە چیە بە نهێنی بەربەڕۆسا؟

- یەکێک لە گرنگترین کارەکتەرەکانی فیلمی چەتەکانی کاریبی بریتی یە لە کەسایەتی چەتە (بەربوسا)، کە وەرگیراوە لە ناوی سەرکردە خیرالدین بەربەڕۆسا، کە تاوەکو ئێستاش لای مەسیحیەکان یەکێکە لە بەناوبانگترین چەتەکان، سەرکردەی مسوڵمانی ئینگلیزی جاک وارد وڵاتی تونسی کردە بنکەی جێبەجێکردنی کردە دەریایەکانی دژی کەشتیەکانی ئیسپان و هاوپەیمانەکانی، هەر لەم وڵاتەش لە ساڵی ١٦٢٢ز کۆچی دوایی کردوە، لەم سەردەمەدا ویلایەتی تونس یەکێک بووە لە بەهێزترین ولایەتە عوسمانیەکان، بۆیە هۆلیۆدی بەرهەمهێنەری ئەم فیلمە هێمایەکیان داناوە لەناو فیلمەکە کە ئاماژەدەکات بە تونس، هێماکەش بریتیە لە میدالیایەک کە پاڵەوانی فیلمەکە جاک سپارۆ کردوویەتیە گەردنی، لەسەر ئەم میدالیایە هێمای خەلافەتی عوسمانی کێشراوە، کە بریتیە لە ئەستێرەو مانگێک، عبدالعزیز دەتوانی ئەمە ببینی لەسەر وێنەی ئەو کەلەسەرەی بەردەستت.



- وێنەی میدالیاکە لەسەر وێنەی کەلەسەرەکە هەیە، بەڵام تەنها بریتیە لە ئەستێرەیەک بەبێ مانگ!

- چی؟ ئەمە مەحاڵە! ئەو داتاشراوەی دیزنی لەسەر میدالیاکەی جاک سپارۆ کێشاویەتی مانگ و ئەستێرەی بەیەکەوە لەسەرە، تۆ دڵنیایی لەوەی دەیڵێی؟

عبدالعزیز بەدەستی هێمای بۆ وێنەکە کرد و گوتی:

- خۆت سەیری بکە نیزال، تەنها هێمای ئەستێرەی لەسەر کێشراوە.

نیزال سەیری وێنەکەی دەستی عبدالعزیزی دەکرد بەبەردەوامی بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات بۆ ماوەی نزیکەی خولەکێک، پاشان خەندەیەکی کرد و گوتی:

- سوپاس عبدالعزیز، لەسەرەتادا تێبینی نەبونی مانگم نەکردبوو لەسەر میدالیاکە، تۆ بەم تێبینیە وردەت توانیت پەنی

کۆتایی نهێنی بەریەڕۆسا بدۆزیەوە، ئەویش بریتیە لە: ئەستێرەی پێنجی، کۆتا هێمای نهینی بەریەڕۆسا.

- مەبەستت چیە؟!

- ئەورووپیەکان لەسەدەکانی ناوەڕاست، بە کەناراوەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای باکوری ئەفریقایان دەوت (کەناراوەکانی بەربەری) (Barbary Coast)، کە ئێستا هەریەکە لە وڵاتانی لیبیا، تونس، جەزائیر، مەغریب دەگرێتەوە، ئاڵای تەواوی ئەم وڵاتانەش هێمای دەوڵەتی عوسمانی کە بریتی یە لە ئەستێرەو مانگ لەخۆدەگرن جگە لە یەک وڵات، کە ئاڵاکەی تەنها یەک ئەستێرەی تێدایە، ئەویش وڵاتەکەی تۆیە هاوڕێ.

- بەڵام نیزال پەیوەندی مەغریب چیە بە جاک وارد و نهێنی بەریەڕۆسا؟

- کارەکە پەیوەستە بەو هێمایەی دانەری نهینی بەریەڕۆسا لایداوە لە میدالیاکە، هێمای مانگ.

عبدالعزیز دووبارە پرسی:

- هێمای مانگ پەیوەندی چییە بە وڵاتی مەغریب؟

- مانگ هێمایە بۆ ئەو شوێنەی جاک وارد ماوەیەک تیایدا ژیاوە، مانگ هێمایە بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ کە جەنگاوەرانی دەریا دایانمەزراند لە مەغریب.

- چی؟ وڵاتی سەربەخۆی جەنگاوەرانی دەریا؟!

نیزال زەردەخەنەکی کرد بەڕووی عبدالعزیز کە توشی پەشۆکان بوو بوو، پاشان گوتی:

- هاورێ سڵاوت لێ بێت لە ((کۆماری بورقراق))!

***

## دەوڵەتی جەنگاوەرانی دەریا

## ((کۆماری بورقراق))



- چیرۆکی ئەم دەوڵەتە چیە نیزال؟
- مێژووی ئەم دەوڵەتە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەی زاینی دەگەڕێتەوە، لە مێژوودا بە (کۆماری ئەبی ڕەق ڕاق) ناسراوە، هەروەها خەڵکی مەغریب پێی دەڵێن: (کۆماری بورەقراق)، هەروەها پێشی دەوترێت: (کۆماری جەنگاوەرانی دەریا)، هەروەها لە مێژووی مەسیحی بە (کۆماری چەتەکان) یان (کۆماری سەلا) (Republic of SalÈ)ناسراوە، ئەم کۆمارە سەربەخۆیە لە

پێزگەی ڕووبـاری (ئەبـی ڕەق ڕاق) لە نزیـک زەریـای ئەتڵەسـی
بەرکەوت، ناوەندەکەی هەردوو شاری (سەلا) و (ربـاط)ی مەغریبـی
بوو.

- سـەرەڕای ئەوەی چەنـدان جـار سـەردانی ئەو دوو شـارەم کردووە، بەڵام لە ژیانم هەواڵی ئەم دەوڵەتەم نەبیستوە کە لەم دوو شارە مەغـریبیە دامەزراوە، وادیـارە مـن زۆر ناشـارەزام لە مێـژووی ڕاستەقینەمان نیزال!

- بەداخەوە هاوڕێ ئەمە تەنها پەیوەسـت نـیە بەتـۆوە، وانەی مێژوو لەو وانانە بوو کە لە کاتی خوێندنم بەهـۆیەوە توشـی زیـاترین بێهیوایی و نائومێـدی دەبـووم، لەبەرئەوەی ئەم وانەیە بەشـێوەیەکی وشک و دووبارە بە قوتابیان دەوتـرێتەوە، بەداخەوە ئەم وانەیە هـیچ گرنگیەکـی ئەوتـۆی پێـنەدراوە لەلایەنـی پێشـکەوتن و شـێوازی گرتنەوەی بە شێوەیەک کە قوتابی حەزی پێبکات و خۆشـی بوێـت، مێـژوو تەنیـا چیرۆکـی ڕابـردوو نیـیە، بەڵکـو ئـاوێنەی ئێسـتا و قیبلەنمای ئایندەمانە، کاتێک ئـێمە مێـژوو دەخـوێنینەوە لە ڕاسـتیدا لێکۆڵینەوە لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەرهەڵدان و لەناوچونی گەل و شارسـتانیەتە یەک لەدوای یەکەکـان بەدرێژایـی مێـژوو دەکەیـن، سـوود لە ئەزمـونی ئەم گەل و شارسـتانیەتانە دەبینـین، جـا بیروباوەڕیان هەرچیەک بێت، کەسـی ژیـر ئەو کەسـەیە کە سـەیری جیهانی دەوروبەری دەکات بە جیهانبینیەکی فـراوان، نەک تەنیـا بەر قاچەکانمان ببینین، ئێستا کـاتی ئەوە هـاتووە بەشـێوەیەکی جیـاواز

دەست بە خوێندنی مێژوو بکەین، بەشێوەیەک لە ئێستامان تێبگەین و ئایندەمان بنیادبنێین.

- عبدالعزیز مێژووی ئەم دەوڵەتە پێوەستە بە مێژووی ئەو کارەساتەی بەسەر مسوڵمانانی ئەوروپی ئەندەلوسدا هات، دوای چەندساڵێک لە کەوتنی ئەندەلوس لە سەدەی پازدەی زاینی، کاسۆلیکیەکان توانیان کۆتایی بە بوونی هەر دیاردەیەکی ئیسلامی بهێنن لە ئەندەلوس، لەڕێی پاکتاوکردنی نەژادی دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ئەندەلوس لە مسوڵمان و جولەکە، ئەمەشیان یان بە سزادان و کوشتن لە دادگاکانی پشکنین یان بە دەرکردن و ئاوارەکردن هێنایەدی، لە سایەی ئەو کەشە پڕ لە کوشتن و تیرۆرە پاشای ئیسپانیای کاسۆلیکی پێی هەستا، ژمارەیەک لە مۆریسکیە دەوڵەمەندەکان دوای کەوتنی ئەندەلوس توانیان بۆ ماوەی نزیکەی ١٠٠ ساڵ بمێننەوە، ئەم مۆریسکیانە پێیان دەوترێت (حرناشیەکان) کە ناوی ناوچەیەکە لە ڕۆژئاوای ئەندەلوس پێی دەوترێت (Hornachos) و ئەم کەسانە تێیدا نیشتەجێبوون، حرناشیەکان توانیان بمێننەوە لە خاکەکەیان بەهۆی دەوڵەمەندی و دەسترۆیشتویان لە ئەندەلوس، بەڵام ئەم بارودۆخە لە بەرواری ٩ی ٤ی ١٦٠٩ز گۆڕا، کاتێک پاشای کاسۆلیکی ئیسپانی (فلیپی سێیەم) (Philip III) بڕیاری دەرکردنی یەکجاری مۆریسکیەکانی دا، بەم هۆیەوە هەزاران مۆریسکی کۆچیانکرد بۆ مەغریب و وڵاتانی باکوری ئەفریقیا، بەهۆی جیاوازی زمان و کەلتورەوە زۆربەی ئەم کەسانە لە ناوچە سنوریەکان نیشتەجێبوون، زۆرێکیان لە شارەکانی

باکوری مەغریب نیشتەجێبوون، بەتایبەت شارەکانی تەنجە و تەتوان، هەروەها هەزاران حرناشی لە ناوچەی ڕێژگەی ڕووباری ئەبی ڕەق ڕاق لای شارەکانی سەلا و ریبات نیشتەجێبوون، لەو کاتەدا ریبات شارێکی بچوکی تەواو نەکراوبوو، حرناشی و ئەندەلوسیەکان بەشێوەیەکی گشتی شەڕکەری ئازاو دلێر بوون، بۆیە هاتنە پاڵ مەغریبیەکان لە بەرپەرچدانەوەی هێزەکانی ئیسپان و پرتوگالیەکان کە توانیبویان چەند شارێکی مەغریبی داگیر بکەن بەهۆی خیانەتی چەند سوڵتانێکی سەعدییەکان، حرناشیەکان بڕیاریاندا تۆڵە لە ئیسپانیەکان بکەنەوە کە لەخاکی خۆیان دەریان کردبوون، بۆیە لە ئاوەکانی زەریای ئەتلەسی هێرشیان دەکردە سەر کەشتیەکانی ئیسپانیە داگیرکەرەکان، لەگەڵ بڵاوبونەوەی هەواڵی سەرکەوتنەکانیان، ژمارەیەکی تر لە ئەندەلوسیە ئاوارەکان هاتنە پاڵیان، هەروەها ژمارەیەک لە دانیشتوانی مەغریب لە عەرەب و ئەمازیغیەکان هاتنە پاڵیان، سەرەڕای زۆرێک لە دەریاوانە ئەوروپییەکان، کە هەندێک لەم دەریاوانە ئەوروپیانە مەسیحی بوون و دەیانویست تۆڵە لە تاوانی ئیسپانیە کاسۆلیکەکان بکەنەوە دەرحەق بە مەسیحیە پرۆتستانتەکان، هەروەها ژمارەیەک ئەوروپی مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، ژمارەیەک لەم دەریاوانە ئەوروپیانە ئینگلیزی بوون، یەکێک لەمانەش جاک بێردی بوو، کە ماوەیەک لەم ناوچەیە ژیاوە.

- ئایە هیچ ئینگلیزیەکی ناوداری تر هەیە لە مێژوودا کە هاتبێتە پاڵ مسوڵمانان لەم کاتەدا؟

- ژمارەیەکی زۆر سەرکردەی مسوڵمانی ئینگلیزی لەم کاتەدا دەرکەوتوون، یەکێک لەوانە سەرکردەی مسوڵمانی ئینگلیزی (سامسۆن ڕۆلی) (Samson Rowlie) بوو، کە خەڵکی (نۆرفۆلک) بوو، دوای مسوڵمانبوونی ناوی خۆی کردە (حەسەن ئاغا)، هەروەها لە دەستەی کەشتیەوانەکانی سەرکردەی ئینگلیزی جاک بێردی ژمارەیەک لە دەریاوانی ئینگلیزی هەبوون، تەنیا مسوڵمانە ئینگلیزیەکان نەبوون کە ناویان دەرکردوو و مسوڵمان بوون و هاتونەتە ڕیزی مسوڵمانان لەم کاتەدا، بەڵکو لەنێو ئەورووپییە مسوڵمانەکان ژمارەیەک سەرکردەی هۆڵەندی هەبوون کە سەرکردایەتی کەشتیگەلی ئیسلامیان کردووە.
- ببورە نیزال، دەتەوێت پێم بڵێیت کە لە ساتێک لە ساتەکان سەرکردەی مسوڵمانی هۆڵەندی هەبووە؟!
- عبدالعزیز ڕەنگە توشی شۆک ببیت گەر بزانی دووەمین فەرمانڕەوای جەنگاوەرانی دەریا لە مەغریب، بریتی بووە لە سەرکردەی مسوڵمانی هۆڵەندی (یان یانزون ڤان هارلم) ( Jan Janszoon Van Haarlem)، کە بە (موراد ڕەیسی بچووک) (Murat Reis The Younger) ناسراوە و ساڵی ١٦٢٤ز هەڵبژێردرا، تاوەکو ببێتە دووەم فەرمانڕەوای ئەم کۆمەڵە تێکۆشەرە، ئەم سەرکردە هۆڵەندیە تاکە هۆڵەندی دیاری مسوڵمان نەبووە، بەڵکو سەرکردەیەکی تری مسوڵمانی هۆڵەندی بریتی بوو لە (ئیڤان دیرکی دی ڤینبوور) ( Ivan Dirkie De Veenboer) کە دوای مسوڵمانبونی بە (سلێمان

ڕەیس) (Sulayman Reis) دەناسرا، ئەم کەسە هۆڵەندیە لە بەناوبانگترین سەرکردە دیارەکان بوو لە هێزی دەریایی هۆڵەندی، بەڵام دوای ئەوەی مسوڵمان بوو لە پاڵ هێزی دەریایی عوسمانی لە جەزائیر دەجەنگا، هەروەها یەکێکی تر لە سەرکردە مسوڵمانە هۆڵەندیەکان بریتی بوو لە (زیمن دانسکر) ( Zymen Danseker)، ئەم سەرکردەیە خەڵکی شاری (دوردریخت) بوو، پاشان کۆچیکرد بۆ فەرەنسا و کچی پاریزگاری شاری (مەرسیلیا)ی فەرەنسی خواست، دوای ئەوە کۆچیکرد بۆ جەزائیر و مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و چووە پاڵ هێزەکانی جەزائیری، ئەم سەرکردە هۆڵەندیە دوای مسوڵمانبونی بە (سیمۆن ڕەیس) ( Simon Reis) بەناوبانگ بوو، هەروەها یەکێک بوو لە هاوڕێکانی سەرکردەی ئینگلیزی جاک بێردی.

- پێشتر نەمدەزانی هۆڵەندیەکان مێژوویەکی زۆر کۆنیان لەگەڵ ئیسلام هەیە، زانیاریم دەربارەی هۆڵەندا لە زانینی ناوی چەند یاریزانێکی هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئەو وڵاتە تێنەدەپەڕی! با بگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەمان نیزال، چۆن دەوڵەتی جەنگاوەرانی دەریا پێکهات؟

- تەواوی ئەم گروپە جیاوازە جەنگاوەرانە لە ئەندەلوسی و ئەورووپی و عەرەب و ئەمازیغی لەژێر یەک ئامانج کۆبیونەوە: تۆڵەکردنەوە لە ئیسپان و هاوپەیمانە داگیرکەرەکان، ئەم کۆمەڵە جەنگاوەرە لە ساڵی ١٦١٤ز لە نزیک ڕێژگەی ڕووباری ئەبی ڕەق ڕاق لای هەردوو شاری سەلا و ریبات توانیان دەوڵەتێک دروست بکەن،

ئەمانە هەستان بە دانانی سیستەمی بەڕێوەبردنی بەکۆمەڵ، کە لە سەرەوەیان سەرکردەیەک هەیە هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی ساڵێک و دەستەیەکی ڕاوێژکاری یارمەتی دەدات لە فەرمانڕەوایی کە پێی دەوترا (الدیوان) و لە ١٦ ئەندام پێکهاتبوو سەرکردەی دەریا (ئەمیراڵ) سەرکردایەتی دەکرد، (ئیبراهیم بارگاس) ( Ibrahim Vargas) کە یەکێک لە حرناشیە ئەندەلوسیەکان بوو، وەکو یەکەمین فەرمانڕەوای ئەم دەوڵەتە هەڵبژێردرا، پاشان سەرکردەی هۆڵەندی (موراد ڕەیسی بچووک) بووە دووەمین فەرمانڕەوا، جەنگاوەرانی دەریا لە ساڵی ١٦٢٤ز کۆماری سەربەخۆی خۆیان ڕاگەیاند و خۆیان لە گوێڕایەڵی سەعدییەکان دارنی و توانیان نزیکەی چوار دەیە درێژە بە فەرمانڕەواییان بدەن، لەم ماوەیەدا شکستی گەورەیان توشی کەشتیگەلی ئیسپانی کرد، هەروەها هێرشیان دەکردە سەرکەناراوەکانی ئینگلتەڕا و ئێرلەندا، هەروەها بە کەشتیەکانیان تاوەکو کەناراوەکانی ئایسلەندای ئەوپەڕی باکوری ئەوروپی دەڕۆیشتن، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ئەم دەوڵەتە بەهۆی ناکۆکیەکانی دەستە پێکهێنەرە جیاوازەکانی دەوڵەتەکە پارچە پارچە بوو، خۆشەویستی ماڵ و فەرمانڕەوایی زۆرێکیان دەستخەڕۆ بوون، و کەوتنە داوی ناپاکی و خراپەکاری، ئەم کۆمارە بچوکە بۆ چەند دەوڵەتۆکەی سەربەخۆ دابەشبوو، کە هەریەکەیان پشتیان بە دەوڵەتە بێگانەکان دەبەست لە دژی یەکتری، لەم کاتەدا مەغریب بە شێوەیەکی گشتی بە قۆناغێکی سەختی پەرتەوازەیی و پارچە پارچەیدا تێدەپەڕی لە نێوان دەوڵەتە جیاوازەکان، تاوەکو

عەلەویەکـان دەرکەوتـن و لە سـاڵی ١٦٦٨ز توانیـان بە یەکجـاری کۆتایی بە کۆماری بو ڕەق ڕاق بهێنن، عەلەویەکان توانیـان مەغریب یەک بخەن و تاوەکو ئەمڕۆش ئەم بنەمـاڵەیە فەرمـانڕەوای مەغریبن لەو کاتەوە.

- کەواتە نیـزال وەکـو مـن لێـت تێگەیشـتبم، بەپێـی لێکدانەوەکانت بـۆ چیرۆکـی سـەرکردەی ئینگلیـزی و ئەو وێـنەیەی چەتەکانی کاریبی کە دەستمانکەوت، تـۆ پێتـوایە کە پەتـی کۆتـایی نهێنی بەربەڕۆسـا لەو شـوێنەیە کە کۆمـاری بـو ڕەق ڕاقـی تێدابوو، ئەوەش واتـای ئەوەیە کە بـۆ دۆزینەوەی پەتـی کۆتـایی بەربەڕۆسـا دەبێت لەنێوان هەردوو شاری سەلا و ریبـات بگەڕێین، ئـایە دەزانـی ڕوبەری ئەم دوو شارە چەندە؟!

نیزال بە پێکەنینەوە گوتی:

- کێ گوتویەتی کە پێویستە ئێمە لەنێـوان دووشـاری سـەلا و ریبات بگەڕێین؟

- وادیـارە تـۆ سـووری لەسـەر ئەوەی ژیـریم لەدەست بـدەم! نزیکەی نیو کاتژمێرە تۆ باسی کۆماری بو ڕەق ڕاقم بـۆ دەکەی، کە لەنێو ئەو دوو شارە دامەزراوە، هەروەها پێت گوتم ئەو مـانگەی لە ئاڵاکە ونە هێمایە بۆ ئەم کۆمارە، تکات لێدەکەم پێم بڵـێ پێویستە لەکوێ بگەڕێین؟!

- عبدالعزیز ئێمە لەم ڕووبەرە فراوانە نـاگەڕێین، بەڵکو تەنها لەو قەڵایە دەگەڕێین کە جەنگاوەرانی دەریا کردیانە پایتەختیان.

- ئەم قەڵایە کامەیە کە پایتەختی کۆماری بو ڕەق ڕاق بوو؟

- ئەم قەڵایە نـاوی (قصـبة الودایـة) یە، کـۆنترین قەڵای ریباتی پایتەختی مەغریبە.
- بە باشـی ئەم قەڵایە شـارەزام نیـزال، پێشـتر لە گەشتێکی قوتابخانە سەردانم کردووە، گردێکی گەورەیە، بە دەوریدا قەڵایەکی مەزن هەیە کە دەڕوانێتە سـەر ڕووبـاری ئەبـی ڕەق ڕاق، ژمارەیەکی زۆر لە شوێنەواری مێژوویی لەخۆدەگرێت، لەگەڵ کۆمەڵێک شـەقامی کۆن، بەڵام دەبێـت پێـت بڵـێم: گەڕان لەم قەڵایە وەکو دۆزینـەوەی دەرزی وایە لە کایەندا!
- دانانی مێژووی جاک بێردی ئینگلیزی بۆ ئەوەی ببێتە پەتی کۆتایی نهێنی بەربەڕۆسا واتـای زۆرە، پـێم وایە دانەری ئەم نهێنیە ئـاڵۆزە بەمشـێوەیە ویسـتویەتی ئامـاژە بـۆ شـوێنێک بکـات کە پەیوەنـدی بەهەریەکە لە کۆمـاری بــو ڕەق ڕاق و ئەم دەریـاوانە ئینگلیزیەوە بێت.
- ئەم شوێنە کوێیە؟ عبدالعزیز پرسیاری کرد.
- بەتەواوی نازانم، بەڵام ژمارە (١١٨) کەلەسەر وێنەکە هەیە، کلیلی گەیشتنمانە بەو شوێنە!

***

## لە (قصبة الودایة)

نیزال و عبدالعزیز لەنێو کۆڵانە تەنگەکانی قصبة الودایـة لە ریبـاتی پـایتەختی وڵاتـی مەغریـب دەگەڕان، ئەو ژمارانەیـان دەپشـکنی کە لەسەر بیناکانی ناو قەڵا مەزنەکە هەبوون.

- نیزال تۆ پێشتر سەردانی باشوری ئیسپانیات کردوه؟
- چەند جارێک سەردانی ئیسپانیام کردوه، بەڵام تەنیا سەردانی مەدریدی پایتەخت و چەند شارێکی باکورم کردوە، سەردانی باشورم نەکردووە، بۆچی پرسیار دەکەی عبدالعزیز؟
- کۆڵان و بیناکانی ناو ئەم قەڵایە بیری شارەکانی باشوری ئیسپانیام دەخاتەوە کە پێشتر بینیومە، کۆڵان و بینا کۆنەکانی ئیشبیلیە و قورتوبە و غەرناتە تا ڕادەیەکی زۆر شێوەی ئەمانەن کە لەم قەڵایە دەیانبینین.
- لەبیرت نەچێت عبدالعزیز کە بیناکانی ئەم قەڵایە لەسەر شێوازی ئەندەلوسی دروستکراون، سەرکردەی (مرابطین) (یوسف بن تاشفین) یەکەم بینای ناو ئەم قەڵایەی دروستکرد، موەحدینەکان قەڵاکەیان لە سەدەی دوازدەی کۆچی دروستکرد و ناویان نا (المهدیە)، بەڵام دوای لەناوچونی ئەم دەوڵەتە ئەم قەڵایە بۆ سەدانساڵ فەرامۆشکرا، تاوەکو مۆریسکیە حرناشیەکان تێیدا نیشتەجێوون، دوای دەرکردنیان لە ئەندەلوس لە سەرەتای سەدەی حەڤدە، هەر ئەوانیش ئەم شێوە ئەندەلوسیەیان بۆ ئەم قەڵایە زیادکرد کە لە دەوروبەرت دەیبینی، لەوانەیە لە کاتی گەڕانمان بە کۆڵانەکانی ناو قەڵاکەدا تێبینی ئەوەت کردبێت زۆرێک لەناوەکان کە بەلایاندا تێپەڕین ناوی خێزانی مۆریسکی ئەندەلوسی بوون، وەکو بیرۆ و بلامینۆ و تریدانۆ، تەنانەت دوای لەناوچونی کۆماری بو ڕەق ڕاق و زاڵبونی عەلەویەکان، پاشا عەلەویەکان سووربون لەسەر هێشتنەوەی شێوەی ئەندەلوسی بیناکانی قەڵاکە.



عبـدالعزیز لەکاتێکدا بەدەسـتی ئامـاژەی بـۆ یەکێـک لە بورجەکـانی قەڵاکە دەکرد گوتی:

- نیزال....سەیری ئێرە بکە!
- چی لەوێ هەیە عبدالعزیز؟!
- سەیری بورجەکەی بەرانبەرمان بکە، تەرکیـزت بـخەرە سەر ئەو شـوێنەی پیرەمێـردەکە مۆبایـل دەفرۆشـێت لەبەردەم قەڵاکە، وێنەیەکـی هەڵواسـراو هەیە، هێمـای بـازنەیەکە هێڵێکـی بەنـاودا هاتووە، ئەم هێمایە هیچت ناخاتەوە یاد؟



- ئەمە شێوەی هێمای (دەستەی گواستنەوەیە لە لەندەن)(Transport For London)، لەکاتی تێپەڕبونمان بە نزیک ئەم فرۆشیارە پێش کەمێک تێبینی ئەم هێمایەم کرد، بەڵام پێم وابوو کە ئەم هێمایە لە مەغریب بۆ یەکێک لە کۆمپانیاکانی مۆبایل، یاخود لایەنێکی حکومی بێت، بۆیە گرنگیم پێنەدا.

- نیزال ئێمە لە مەغریب ئەم هێمایە بەکارناهێنین، ئەم هێمایە هیچت بیرناخاتەوە؟

- مەبەستت چییە عبدالعزیز؟!

عبدالعزیز زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

- ببورە هاوڕێ، لەبیرم چوو تۆ بەدەست کەمی تەرکیزەوە دەناڵێنی، ئەم هێمایە هەمان هێمای سەر وێستگەی پاسەکانی بەرانبەر شوقەکەتە لە لەندەن، کە تەنها یەک پاسی پێدا تێپەڕدەبێت، ئەویش پاسی ژمارە (١١٨)یە.

نیزال دەستی خستە سەر شانی عبدالعزیز و بە خۆشحاڵیەوە گوتی:

- عبدالعزیز، نازانم بێ تۆ لەم ژیانە چی بکەم!

عبدالعزیز بە پێکەنینەوە گوتی:

- منیش بەردەوام هەمان پرسیار لەخۆم دەکەم، کاتێک بەدوات ڕادەکەم بۆ ئەوەی کلیل و کەلوپەلەکانت بۆ بهێنم کە دوای سەردانی کردنم لە شوقەکەم لەبیریان دەکەیت.
- وادیارە هاوڕێ، دانەری نهێنی بەربەڕۆسا زانیاری دەربارەی ژیانم زۆرە، ئەو تەنانەت ژمارەی ئەو پاسەش دەزانێت کە بە بەردەم شوقەکەمدا تێدەپەڕێت!
- ئەوە سەیر نییە نیزال، بەوەی لەم چەند ڕۆژە کەمە بینیومانە، دڵنیابووم لەوەی ئەو کەسە زانیاری پێویستی لەبەردەستە لەبارەی تۆ کە ڕێی پێدەدات جوڵەو ڕێگاکانی بیرکردنەوەت بزانێت!

نیزال و عبدالعزیز بەرەو لای ئەو بورجە چوون کە ئەم نیشانەیەی لەسەر هەڵواسرابوو، سەرکەوتنە سەر لوتکەکەی و، بە وردی دیوارەکانیان پشکنی، بەڵام هیچ شتێکی جێ بایەخیان دەست نەکەوت، دوای نزیک کاتژمێرێک لە گەڕانی بەردەوام، بڕیاریاندا کەمێک پشوو بدەن، پێش ئەوەی بەردەوامی بە گەڕانەکەیان بدەن، لە بورجەکە دابەزین و بەرەو فرۆشیاری مۆبایلی بەردەم بورجەکە چوون.

- سەلام و عەلەیکوم مامە گیان، چۆنی؟
- عەلەیکوم سەلام، سوپاس بۆ خودا باشین، مۆبایل یاخود سیمکارتتان دەوێت؟

عبدالعزیز وتی:

- ببورە مامە، ئێستا پێویستیمان بەمانە نیە، تەنیا دوو بتڵ ئاوی ساردمان دەوێت.

- ئاوم بۆ فرۆشتن لەلا نییە، بەڵآم فەرموون لەو شوشەیە بخۆنەوە کە من لێی دەخۆمەوە.

نیزال و عبدالعزیز بەیەکەوە وتیان:

- سوپاس بۆ بەخشندەیی و دڵفراوانیت مامە.

دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز ئاوەکەیان خواردەوە، سوپاسی پیاوە پیرەکەیان کرد و پاشان عبدالعزیز لێی پرسی:

- چیرۆکی ئەم بورجە چیە مامە؟

- مەبەستت (بورجی سیراتە)؟

- نیزال بە پەرۆشیەوە پرسی: ناوەکەی ئەمەیە؟!

- بەڵێ، ئەم بورجە یەکێکە لە سێ بورجە گەورە پێکهێنەرەکەی (قصبة الوداية)، ئەمانیش بریتین لە بورجەکانی: (الصقالة)، (برج الدار) و (برج الصراط)، ئەم بورجە لە سەدەی هەژدەی زاینی دووبارە لەلایەن ئەندازیارێکی ئینگلیزی مسوڵمان بەناوی (ئەحمەدی ئینگلیزی) (Ahmed The English) چاککراوەتەوە.

- نیزال پرسی: وا دیارە تۆ بەباشی مێژووی ئەم بورجە دەزانیت، مامە تۆ لەکەیەوە لەبەردەم ئەم بورجە هاندی مۆبایل دەفرۆشیت؟

- زیاتر لە دە ساڵە من لەبەردەم ئەم بورجە هاندو سیمکارتی مۆبایل دەفرۆشم.

- مامە گیان توخودا پێم بڵێ ژمارە (١١٩) بۆ تۆ هیچ شتێک دەگەیەنێت؟

- ئەم ژمارەیە، ژمارە مۆبایلی تایبەتە بە خزمەتگوزاری نامەی دەنگی تایبەت.

- نیزال پرسی: نامەی دەنگی تایبەت؟!

- هەنـــدێک لە کۆمپانیاکـــانی پەیوەنـــدی خزمەتگـــوزاری جێهێشتنی نـامەی دەنگـی بـۆ بەژداربوانیـان دابـین دەکەن لەکاتێـک کەسی پەیوەندی پێوەکراو نەتوانێت وەڵامی پەیوەندیەکەی بداتەوە، لەم کـاتەدا کەسـی پەیوەنـدیکەر دەتوانێـت ئەم خزمەتگـوزاریە بە خۆرایی وەربگرێت و نامەی دەنگی جێبهێڵێت، ئەمەش دوای ئەوەی دوو ژمـارەی نهێنـی هەڵـدەبژێرێت کە هەریەکەیـان لە سـێ خـانە پێکهـاتوون، بـۆ زیـاتر سـەلامەتی نـامە دەنگـیەکە مەرجە ژمـارەی سیانی یەکەم نوسراو و ژمـارەی سـیانی دووەم بیسـتراو بێـت، دوای ئەوە کەسـەکە دەتوانێـت نـامە دەنگـیەکەی جێبهێڵێـت، بەم دوو ژمارەیە، پاشان کەسی پەیوەندی پێـوەکراو دەتوانێـت پەیوەنـدی بە ژمارە (١١٩) بکـات و گـوێ لە نـامە دەنگیە تۆمـارکراوەکە بگرێت، ئەمەش دوای ئەوەی یەکێـک لە دوو ژمـارە نهێنـیەکە دەنوسـێت و ئەوی تریان دەخـوێنێتەوە.

-

عبدالعزیز پرسـی: باشـە ئەگەر کەسـێک ژمـارەیەک هەڵبژێرێت کە پێشـتر لەلایەن کەسـێکی تـرەوە هەڵبژێردرابێـت چـی ڕوودەدات؟

-لەم کـاتەدا داوا لەکەسـەکە دەکرێـت ژمـارەیەکی تـر هەڵبژێرێـت، تاوەکو لە کۆتایدا ژمارەیەکی بەتاڵ دەدۆزێتەوە، بەهەرحاڵ ئەم کارە

بەدەگمەن دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی نامەی دەنگی تۆمارکراو تەنها جارێک دوای گوێ لێگرتنی ڕاستەوخۆ دەسڕدرێتەوە، هەروەها دوو ژمارە نهێنییەکەش دەسڕێنەوە، بەمەش جارێکی تر بەردەست دەبن بۆ کەسانی تر.

نیزال ڕوخساری گەشایەوە و زەردەخەنەیەکی کرد و بە فرۆشیارە پیرەکەی گوت:

- زۆر سوپاس مامە گیان بۆ زانیاریە بەنرخەکانت، زۆر سودمان لێ بینی، دووبارە سوپاس بۆ بەخشندەیی و دڵفراوانیت.

دوای ئەوە دووبارە نیزال و عبدالعزیز سەرکەوتنەوە سەرەوەی بورجەکە و، نیزال لەپاڵ یەکێک لە تۆپهاوێژە مێژووییەکان وەستا کە لەسەر ڕووی بورجەکە جێگیرکرابوو، لە ڕێژگەی ڕووباری ئەبی ڕەق ڕاق لە زەریای ئەتڵەسی لە دیمەنی خۆرئاوابونی دەڕوانی، عبدالعزیزیش لەبەردەم نیزال وەستابوو سەری سوڕمابوو لە بێدەنگیەکەی.

- بەم بۆنەیەوە نیزال، دیمەنی خۆرئاوابون جوانیەکی تایبەتی هەیە لەشاری خریبکە، دەتوانی لەوێ بۆ ماوەیەکی زۆد لەخۆرئاوابون وردبییەوە، دەکرا منیش لەپاڵ دایکم بام کە تەنانەت تاوەکو ئێستاش بە هاتنەوەم بۆ مەغریب نازانێت، تاوەکو خۆم یەکلایی بکەمەوە بۆ گەڕان و دۆزینەوەی ئەم نهێنیە کە ژیانی سەرەوژوور کردم، بۆیە سوپاست دەکەم ئەگەر بەشێوەیەکی کاتی واز لەم دیمەنە ناوازەیە بهێنیت و کەمێک بیر لە نهێنی بەریەڕۆسا بکەیتەوە!

- نیزال له کاتێکدا له دیمەنی خۆرئاوابون وردببویەوە وتی: شتێکی زۆر لۆژیکیە؟

- مەبەستت چیە نیزال؟

- هێماکانی نهێنی بەربەڕۆسا، هەریەک لەم هێمایانە بەستراون بەشتێکی تر بە شێوەیەکی زۆر سەیر، ئەم شوێنە بەهۆی پەتی جاک بێردی ئینگلیزی پێی گەیشتین، ئێستاش ئێمە لەسەر بورجێکین کە مسوڵمانێکی تری ئینگلیزی دووبارە بنیادی ناوەتەوە، ئەوەش کە ئێمەی گەیاندە ئەم بورجە هێمای وێستگەی پاسەکانی لەندەنی پایتەختی ئینگڵتەرا بوو، لەکاتێکدا ئێمە ئێستا لە ریباتی پایتەختی وڵاتی مەغریبین، نەک هەر ئەوە بەڵکو تەنانەت هێمای ناوەکانیش واتای گەورەیان هەیە، هێمای ئەم بازنەیە کە هێڵێکی بەناودا هاتوە لە هێمای دەستەی گواستنەوە، لە ڕاستیدا بریتیە لەو ڕێگایەی دوو خاڵ بەیەکتری دەگەیەنێت، ئەم بورجەش ناوی (برج الصراط)ە واتە بورجی ڕێگا، ئێمەش ئێستا لە کۆتایی ڕێگای گەڕانین بەدوای نهێنی بەربەڕۆسا، تەنانەت ئەو ژمارەیەش کە ڕێنمایی کردین بەرەو ئەم بورجە بریتیە لە ژمارەی ئەو پاسەی کە پێی دەگەمەوە شوقەکەم، بەواتەیەکی تر بەوە دەگەم بە کۆتایی ڕێگاکەم، تەنانەت بوونیشم لەم جێگایە لە کۆتایی ئەم گەشتە زۆر لۆژیکیە، چونکە فینیقیەکانی باپیرانی فەڵەستینیەکان دوای گەشتێکی درێژ پێش (٣) هەزار ساڵ هاتونەتە ئێرەو شاری (شالە) (Chellah) یان دروستکردوە، لای دۆڵی ڕوباری ئەبی ڕەق ڕاق و

کردویانەتە پایتەختیان لە مەغریبی دوور، هەر یەکێک لە هێماکانی
ئەم نهێنیە زۆر سەرنج ڕاکێش و سەیرن!

- بەڵام هاورێ لێرە شتێک هەیە بەڕای من زۆر لۆژیکی نیە، پێش کەمێک ئەم مامە بەتەمەنە پێی گوتین پێویستمان بە دوو ژمارەی سیانیە، تاوەکو بتوانین گوێ لە نامە دەنگیە تۆمارکراوەکە بگرین، ئێمەش لەنێو ژمارەکانی بێژینگەکە تەنها ژمارەی کۆتایی ژمارە (١٢٠)مان بۆ ماوەتەوە!

- عبـــــدالعزیز دەتـــــوانی مۆبـــــایلەکەتم پێبـــــدەیت؟

عبدالعزیز مۆبایلەکەی بە نیزال داو نیزال پەیوەندی بە ژمارە (١١٩)کرد و خستیە سەر دەنگی دەرەکی تاوەکو عبدالعزیزیش گوێی لە قسەکان بێت، پاشان ژمارەی کۆمپانیای پەیوەندی وەڵامی دایەوەو داوایکرد ژمارەی نهێنی یەکەم دابگرن و، نیزال ژمارە (١٢٠)ی داگرت، پاشان داوای ژمارەی نهێنی دووەمی کرد، لەم کاتەدا عبدالعزیز سەیری چاوەکانی نیزالی کردو دوای چەند چرکەیەک لە بێدەنگی کە وەکو ساڵێک وابوو بۆ عبدالعزیز، نیزال ژمارەی نهێنی دووەمی وت، ئەم ژمارەیە هەمان ژمارە بوو کە نیزال پێش ئەوە بە چەند ساڵێک وتبوی، منداڵێکی فەلەستینی بچوک، کە مامۆستا زۆردارەکەی بە هەموو ڕێگەیەک دەیەویست ڕێگای لێبگرێت لە گەڕان بەدوای ئەم ژمارەیە، ڕەتیکردەوە وەکو زۆربەی هاورێکانی هەمـــوو بەیـــانیەک ئەوە بڵێـــتەوە کە پێـــی دەڵـــێن، ڕەتیکردەوە تەنیا شوێنکەوتەیەک بێت و چی پێ بڵێن دوبارەی بکاتەوە بەبێ بیرکردنەوە، ڕەتیکردەوە کە ماسیەکی مردوو بێت و

شەپۆلەکان چۆن بیانەوێت لەگەڵ خۆیان ببەن، بۆیە بڕیاریدا خۆی بەدوای ئەم ژمارەیەدا بگەڕێت کە دواتر بۆی دەرکەوت تەنیا ژمارەیەکی سادەیە، بەڵام لەگەڵ سادەیەکەی لە ناوەڕۆکی خۆیدا واتایەکی گەورەی هەڵگرتبوو، واتای بەرەنگاری بەڕووی بایە سەختەکاندا، واتای بەرگری و تەسلیم نەبوون بۆ زۆرو ستەم، لاوازنەبوون لە ڕێگای سەختی ژیان و، ملکەچ نەکردن بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت لە ناخەوە مرۆڤ تێکبشکێنن، ئەو ژمارەیە هەمان ژمارە بوو کە ڕێڕەوی ژیانی نیزالی گۆڕی، پاڵی پێوەنا بۆ خۆشەویستی زانست، هەروەها ڕۆحی بەرەنگاری و گەڕان و دۆزینەوەی لە ناخیدا ڕواند، ئەم ژمارەیە ژمارەی داواکراوی دووەم بوو:١٠١!!

***

## پەرۆشم بۆ بینینت ڕۆڵەکەم!

هەرکە نیزال ژمار (١٠١)ی گوت ڕاستەوخۆ ئامێرە دەنگیەکە، بەم وشانە وەڵامی دایەوە:

- یەک نامەی دەنگیت هەیە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٢٠)ی مایۆ.

دوای ئەوە نیزال و عبدالعزیز گوێیان لە نامە دەنگیە تۆمارکراوەکە گرت:

سڵاو ١٠١، پەرۆشم بۆ بینینت ڕۆڵەکەم، دڵنیابووم دەگەیتە ئێرە و، دەتوانی کۆدەکانی نامە نهێنییەکە بکەیتەوە، من هەر لەوسانەوە منداڵ بویت هیچ ڕۆژێک باوەڕم بەخۆت و تواناکانت لەدەستنەداوە، ئێستاش بەباشی گوێم بۆ بگرەو ئاگاداربە چیت پێدەڵێم لەم نامە دەنگیە، چونکە تۆ لە جارێک زیاتر ناتوانیت گوێی لێبگری، پێش ئەوەی بەشێوەی خودکارانە ڕەشببێتەوە، پێش چەند ساڵێکی زۆر، ئەوکاتەی تۆ تەمەنت سێ ساڵان بوو، من خەریکی ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەم بووم لەبواری مێژوو، ئەو بابەتەی لێکۆڵینەوەم لەسەر دەکرد بابەتێکی تازەبوو، لەبەر کەمی لێکۆڵینەوەکانی پێشوتر لەسەری زۆرکەس ئامۆژگاریان کردم واز لە بابەتەکە بهێنم، بەڵام من بەردەوام بووم لە بەدواداچوون لەسەر هەمان بابەت، بەڵام لە سەرەتادا کارەکە زۆر لەوە ئاڵۆزتر بوو کە چاوەڕوانم دەکرد، بابەتەکە لە ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراوی دەکۆڵیەوە کە بۆ ماوەی سەدان ساڵە لەبیرکراوە، ئەمەش زیاتر هانیدام لەسەر بەردەوام بوونی لێکۆڵینەوەکەم، نامەم بۆ چەندین زانکۆی جیهانی نارد تاوەکو بە سەرچاوە و نامەی تری ئامادەکراو لەسەر هەمان بابەت یارمەتیم بدەن، دوای ئەوەی کورتەی لێکۆڵینەوەکەی خۆمم بۆ نوسیبون، توشی سەرسوڕمان بووم، کاتێک یەکێک لە بەناوبانگترین مامۆستاکانی مێژوو لە جیهان بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەندی پێوەکردم و، سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەم، داوای لێکردم چی پێی گەیشتوم تاوەکو ئێستا پێی بڵێم، کاتێک هەندێک زانیاری لای خۆمم

پێـوت، خـۆی هـاتە لام لە غەزە و، باوکـت بانگهێشـتی کـرد بـۆ ماڵەوەمـان، سـەرم سـوڕما کاتێـک بینـیم ئەم مامۆسـتا بیـانیە بڕە پارەیەکی زۆرم پێـدەدات لەبەرانـبەر پێدانی هەمـوو ئەو زانیاریـانەی تاوەکو ئێستا پێیگەیشتووم و ڕاگرتنـی لێکـۆڵینەوە لە بابەتەکە بۆ هەمیشە، بەڵام ئەمەم لە بنچینەدا ڕەتکردەوە و باوکت زیاتر هانیدام لەسەر بەردەوامی دان بە بابەتەکەو نەوەستان بەهەر هۆکارێک بێت، دوای ئەوەی بـۆم دەرکەوت ئەم پـارەدانەی هەوڵـێکە بـۆ بێـدەنگ کـردنم و زیـاتر لەم بـابەتە دڵنیـابووم، دوای ئەوەی زانـیم ئەم مامۆستایە سەر بە یەکێک لە زانکۆ خێریەکـانی سـەر بە ڕێکخـراوی قدیس یۆحەنـایە، دوای ئەوەی هەمـوو هەوڵەکـان شکستی هێنـا بۆ هەڵخەڵەتاندنم بە پارە، ڕێکخراوەکە نامەیەکی هەڕەشەی بۆ نـاردم و پێیان وتم بەشێوەیەکی تایبەتی تۆ لەناونابەین تاوەکو نەبێـتە جێی گومان لەبەر گرنگی لێکۆڵینەوەکە، بەڵکو لەجیاتی ئەوە خێـزانەکەم لەناو دەبەن وەکو ئەوەی ڕوداوێکـی ئاسـایی ئۆتۆمبێـل بوبێـت، ئەم شتەم بە باوکت گوت و، پێشم ڕاگەیانـد نیـازم وایە بە یەکجاری واز لە لێکـۆڵینەوە لەم بـابەتە بهێـنم، بەڵام ئەو لە نرخـی هەڕەشـەکانی کەم کردەوەو باوەڕی پێهێنام بەردەوام بـم لەسـەر لێکـۆڵینەوەکەم و گـوێ بەم هەڕەشـانە نەدەم کە بە ڕای ئەو جـدی نـین، بەڵام دوای ئەوە بە دوو مانگ باوکت توشی ڕوداوێکی ئۆتۆمبیل بـوو، بەهـۆیەوە پێش ئەوەی بگاتە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد، ئەوکاتە دڵنیابووم ژیانی تـۆش لە مەترسـیدایە، بەهـۆی زانیـاریم دەربـارەی تاوانەکـانی پێشـوتری ئەم ڕێکخـراوە تیرۆریسـتیە، پاشـان پەیوەنـدیم لەگەڵ

سەرکردەکانی ئەم ڕێکخراوە کرد وپێم ڕاگەیاندن کە بە نیازم واز لە لێکۆڵینەوەکەم بهێنم بۆ هەمیشە، هەروەها کۆپیەکی لێکۆڵینەوەکەم بۆ ناردن کە تا ئەو ساتە پێی گەیشتبووم بەڵام دوای ئەوەی زانیاریە گرنگەکانم شاردەوەو بە چەند زانیاریەکی هەڵە گۆڕیمن، برە پارەیەکی زۆریشم لێوەرگرتن تاوەکو باوەڕیان پێبهێنم کە وازم لە لێکۆڵینەوەکە هێناوە، بەڵام ئەو شتەی کە ئەم کۆمەڵە تاوانبارە نەیاندەزانی ئەوەبوو کە من بڕیارم دابوو تۆڵەی باوکت بکەمەوە و، بەردەوامی بدەم بە لێکۆڵینەوەکانم و ئەم ڕاستیانە ئاشکرا بکەم کە ئەم ڕێکخراوە هەوڵی شاردنەوەی دەدەن لە مرۆڤایەتی، لە هەمان کاتدا نەمدەویست ئازار بەتۆ بگات، بۆیە داوام لە پورە خەدیجە کرد ئاگای لە تۆ بێت، دوای ئەوەی تەواوی چیرۆکەکەم بۆ باسکرد، تۆم لای پورت جێهێشت و خۆم فەڵەستینم جێهێشت، تاوەکو لە دەرەوە بەردەوامی بە لێکۆڵینەوەکەم بدەم، دوای گەشتەکەم بە چەند مانگێک من و پورت هەواڵێکی وامان دروستکرد کە بەهۆی دڵتەنگیم بۆ باوکت کۆچی دوایم کردوە، پورت هەواڵی مردنی منی لە هەموو شوێنێک بڵاوکردەوە، بەتایبەت لەو زانکۆیەی کارم تێدا دەکرد، جگە لە پورە خەدیجەت کەس بە زیندوو مانەوەم لە ژیاندا نازانێت، تەنانەت هاوسەرەکەشی، بڕیاریشماندا کارەکە لە تۆ بشارینەوە بۆ ئەوەی ژیانت نەکەوێتە مەترسیەوە، دووریم لە تۆ ئازارێکە لە سەرووی ئازاری دووریم لە نیشتیمان و خاکی خۆم، بەڵام تاکە شتێک کە ئارامی پێدەبەخشیم زانینی هەواڵەکانت و بینینی وێنەکانت بوو کە تۆ لەبەرچاوم گەورە دەبووی، من و پورت هەمیشە لە پەیوەندیدا

بـووین بـۆ دڵنیـابون لە سـەلامەتیت، هەمیشـە مـن لەگەڵ پـورت بەژداربـوم لە پەروەردەکردنـت بەبـێ ئەوەی تـۆ هەستی پێبکەی، تەنـانەت زۆرێـک لە مەتەڵەکـان کە پـورە خەدیـجەت لە منـداڵی ڕاهێنانی لەسەر پێدەکردیت من ئامـادەم دەکـردن، چەنـدە خۆشحاڵ دەبـووم کە هەواڵـی خۆشـم لەبـارەی تـۆ دەبیسـت، لەهەمـان کاتـدا بەردەوامـیم بە لێکـۆڵینەوەکەم دا، بـۆم دەرکەوت زۆر لەوە قـوڵتر و ترسناکترە کە من پێشبینیم دەکرد، لە یەکێک لە گونـدە دوورەکـانی وڵاتی مەغریب نیشتەجێبووم و خـاتونێکی مەغـریبیم ناسـی، بـۆ من وەکو خوشک وابوو، لێرەوە گەشـتم بـۆ زۆرێـک لە ناوچەکـانی دونیـا دەکرد بـۆ ئەوەی زانیـاری پێویسـت بـۆ لێکـۆڵینەوەکەم کـۆبکەمەوە بەبێ ئەوەی ببمە جێی گومانی کەس، بەدرێژایـی چەنـدین سـاڵ لە لێکـۆڵینەوە و گەڕان، گەیشـتمە کۆمەڵێـک زانیـاری زۆر مەترسـیدار، ئەوکات ئەو نهێنـیە تێگەیشـتم کە بـۆچی ڕێکخـراوی قـدیس یۆحەنـا دەیەویســـت دەســـتی بەســـەردا بگرێـــت، پـــێش ئەوەی بتـــوانم لێکۆڵینەوەکەم تەواوبکەم، سووربونی یەکێک لە کۆمپانیا گەورەکـانم هەست پێکرد بۆ گەڕان بەدوای هەمان بابەتی مێژوویی، وەکـو بڵێـی ئەوان زانیبویـان مـن پێشـوتر بـۆ هەمـان بـابەت نـامەم بـۆ چەنـدین زانکـۆی جیهـانی نـاردبوو، بـۆیە ئەو کۆمپانیـایە هەوڵیـان دابـوو پەیوەندی لەگەڵ پورت بکەن بۆ ئەوەی بـزانن چـیم بەسـەرهاتووە و لێکۆڵینەوەکە چی بەسەر هات، پورت پێی وتبون من لەمێژە مردووم و ئەو هیچ شتێک لەو لێکۆڵینەوەیە نازانێـت، دوای پشـکنینێکی ورد دەربارەی چالاکیەکانی ئەم کۆمپانیایە بۆم دەرکەوت، ئەم کۆمپانیایە

تەنها ڕوکەشێکە بۆ ڕێکخراوێکی تاوانکاری مەترسیدار، دەیەوێت دەستەی حەشاشیەکان سەرلەنوێ زیندوبکاتەوە، دوای ئەوە بەچەند ڕۆژێک هەواڵی مردنی پورتم بەهۆی ڕوداوێکی هاتوچۆوە زانی، لەهەمان کاتدا هەستم بە جوڵەیەکی جێ گومانکرد لەلایەن دامەزراوەکانی سەربە سوارچاکانی قدیس یۆحەنا، هەروەها زانیم هەندێک کەس پرسیاری منیان کردوە لەو شوێن و کتێبخانانەی کە لەو سالانەدا تیایاندا گەڕاوم، بۆیە ڕاستەوخۆ لێکۆڵینەوەکەم لە شوێنێکی سەلامەت شاردەوە، هەروەها ئەم نامەم بۆ جێهێشتی بەو مەتەڵەی تیایدایە تاوەکو بتگەیەنێتە ئەم نامە دەنگیە کە ئێستا گوێت لێگرتووە، بۆ ئەوەی دڵنیابم تەنیا تۆ دەتوانی لە واتای هێماکانی ئەم مەتەڵە تێبگەی و بگەیتە ئێرە، لێکۆڵینەوەکەم لای پیاوێکی بەتەمەنی مصری، کە وەکو دەرگاوان لە کتێبخانەی ئیسکەندەریە کاردەکات جێهێشتوە، کە بۆ چەندان ساڵ لە ئەرشیفە کۆنەکەی ئەم کتێبخانەیە گەڕاوم، ئەم پیاوە ناوی حاجی (متولی)یە، پێم گوتوە ئەم نامەیە ئەو خانمە فەلەستینیە جێیهێشتوە کە بەیانیان یەکەم کەس دەهاتە ئەم کتێبخانەیە و تۆ دێی بۆ وەرگرتنی، ئاگاداربە خۆت نەکەیتە جێی گومان و هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە بەدوامدا بگەڕێی یاخود لە کتێبخانە یاخود شوێنێکی تر پرسیارم بکەی، بە ئەگەری زۆر لەوانەیە ئەو کاتەی تۆ گوێ لەم نامەیە دەگریت من لە دونیا کۆچم کردبێت، دوای ئەوەی یەکێک لە دوو ڕێکخراوەکە منیان دۆزیوەتەوە و لەناویان بردوم، گەڕان بەدوام و پرسیارکردنم دەتخاتە تۆڕی ئەم کەسە بکوژانە و

هەلی ئەوەیان پێ دەدەی بتدۆزنەوەو لەناوت ببەن، بەمەش هەلێکی گەورە لەدەست مرۆڤایەتی دەچێت بە ئاشکراکردنی ئەو نهێنیەی کە ماوەی (١٥٠٠) ساڵە بە نهێنی ماوەتەوە، بۆیە دوای بیستنی ئەم نامەیە هەوڵدە ڕاستەوخۆ گەشت بۆ مصر بکەی و بچیتە کتێبخانەی ئەسکەندەریە، بۆ وەرگرتنی ئەو فایلەی بۆم داناوی، هەموو هەوڵێکی خۆت بخەکار تاوەکو ئەم لێکۆڵینەوەیە تەواو بکەی، دوای ئەوەی بە تەواوی دەیخوێنیتەوە، تۆ تەنها کەسی دەتوانی ئەم لێکۆڵینەوەیە تەواو بکەی و، دوای ئەوە ئەم نهێنیە بۆ مرۆڤایەتی ئاشکرابکەی دوای گرتنەبەری ڕێوشوێنی بە سەلامەتی مانەوەت، وەکو باوکت پیاوێکی بەهێزبە، باوکت پیاوێکی بەهێزبوو ڕەتیکردەوە خۆبەدەستەوەبدات یاخود ملکەچی هەڕەشە و هەڵخەڵەتاندن بێت، من هەمیشە بەختیاریم لە چاوەکانی بەدیدەکرد کاتێک هەڵی دەگرتی و هەمیشە دەیگوت هیوا لە چاوە بچوکەکانتەوە دەبینێت، بەڵام پورە نەرم و نیانەکەت تۆ لەمن باشتر دەیناسی، هەرگیز لە نزا و نوێژەکانت لەیادی نەکەی، ڕۆڵە لەبیرت بێت دایکت بە درێژایی ژیانی خۆشیویستوی و تەنها لەبەر سەلامەتیت لێت دورکەوتۆتەوە، ئەگەر جگە لەوەم بتوانیبوایە بۆ هەمیشە لە باوەشم دەمهێشتیەوە، بەڵام قەدەری ئێمە.... حیکمەتی خودا.... ڕێگای ژیان.... بەخودات دەسپێرم ڕۆڵەکەم....والسلام.

***

ئەو کاتەی گوێی لە نامە دەنگیەکەی دایکی گرتبوو فرمێسک بەسەر گۆناکانی نیزالدا دەهاتە خوارەوە، ئەم دەنگە یادگاریە کۆنەکانی منداڵی بەبیردەهێنایەوە، ئەم وشانە هەستەکانی دەبزواندن کە بۆ چەندان ساڵ بەندی سینەی بوون، هەروەها وەڵامی چەندین پرسیاریان دەدایەوە کە بۆ چەندین ساڵ ماخۆڵانی مێشکی بوون، دوای ساتێک بێدەنگی، نیزال سەیری عبدالعزیزی کردو لێی پرسی:

- لە کەیەوە تۆ دەربارەی دایکم دەزانی؟
- نیزال، تێناگەم مەبەستت چییە؟
- بەڵکو زۆر بەباشی لە مەبەستم تێ ئەگەی عبدالعزیز، وادیارە دایکم ئاگاداری تەواوی جوڵەکانم بووە لە بەریتانیا، تۆ سەرچاوەی زانیاریە دروستەکانی بووی، ئەمە ڕاڤەی زۆرێک لە شتەکانم بۆ دەکات، لەسەرەتاوە پلانت دانابوو لە نزیک من بیت، بۆیە ئەو ڕوداوەت دروستکرد کە لە یەکەم بینینمان لە زانکۆ ڕویدا، بۆ ئەوەی دەریبخەی کە یەکتر ناسینمان تەنیا ڕێکەوتێک بووە، بە تێپەڕبونی کات بویتە هاوڕێی نزیکم، بەمەش هەلت بۆ ڕەخسا لە وردەکاری ژیانم ئاگاداربیت، پاشان بۆ دایکمی بگوازیتەوە، تۆ بەردەوام لەگەڵی لە پەیوەندیدا بووی، ئەمەش وەڵامی ئەوەم دەداتەوە کە بۆچی لەناکاو لە مەغریب گەڕایتەوە لە گەشتەکەت، پەرۆشبوونت بۆ کەشی خراپی لەندەن هۆکار نەبوو تاوەکو واز لە پشووی هاوینت بهێنی، بەڵکو بۆ ئەوە گەڕایتەوە تاوەکو نامەکەی

دایکمم پێ بکەیەنی کە نهێنی بەربەرۆسای لەخۆ گرتبوو، بۆیە بەخێرایی تێبینی هێمای وێستگەی پاسەکانی لەندەنت کرد کە دەکەوێتە بەردەم شوقەکەم لە لەندەن، لەبەرئەوەی تۆ خۆت ئەم زانیاریەت پێداوە!

- ئەو خۆی ماوە ماوە گەشتی بۆ لەندەن دەکرد، تەنها بۆ ئەوەی لەم وێستگەیە بوەستێت و هەموو بەیانیەک بتبینێت کە تۆ بە بەردەمیدا تێدەپەڕی!

- کەواتە تۆ ئاگاداری کارەکەی بووی!

- بەڵێ ۱۰۱! بەڵام بەڵێنم بە پورە عائیشەم دابوو لە هەر دۆخێکدا بێت هیچت پێ نەڵێم، دایکت زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی پەیوەندیت لەگەڵ نەکات نەوەک بەهۆی ئەوەوە ئازارێکت پێ بگات، داوای لەمن کرد کارەکەی بشارمەوە، تەنانەت لەکاتی مردنی یاخود ونبونیشیدا، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ خۆت بەکارەکەت زانی، ئێستا من دەتوانم تەواوی شتەکەت بۆ باس بکەم، دایکت نزیکەی ۲۰ ساڵ لەمەوبەر هاتە مەغریب و، لە یەکێک لە گوندە دوورەکانی شاری خریبکە خانوێکی بەکرێ گرت، لەم گوندەدا دەستەیەکی بۆ یارمەتیدانی بێوەژنان پێکهێنا، نیزال، دایکت یارمەتیدەدان بە دامەزراندنی پرۆژەی دەستی بچووک، دایکی منیش یەکێک بوو لەو بێوەژنانەی سودی لەم دەستەیە بینی، بە تێپەڕبوونی کات دایکم و دایکت بوونە هاورێ، پاشان ئەم هاورێیەتیە پەرەی سەند وگۆڕا بۆ خوشکایەتی، بەمەش پورە عائیشە لە جێی دایکی دووەمی منە.

- نیزال بە چاوی پڕ فرمێسکەوە گوتی: زیاترم لەبارەی دایکم پێ بڵێ.

- دایکت کەسێکی دڵنەرم و ڕۆشنبیر بوو، ئەو بۆ هەموو خەڵکی چاکەی دەویست، بەڵام خۆشەویستی بۆ تۆ نەدەتوانرا پێناسە بکرێت، هەمیشە باسی ئەو چەند ساڵە کەمەی بۆ دەکردم کە تۆ لەلای بووی، چەند دڵخۆش دەبوو کاتێک پەیوەندی بە پورتەوە دەکرد، تاوەکو هەواڵی دڵخۆشکەر لەبارەت ببیستێت، لە کاتێکدا ئەگەر پورت هەواڵێکی ناخۆشی لەبارەی تۆ یاخود هەواڵی نەخۆشکەوتنتی بۆ باسبکردایە بەردەوام دەگریا، دایکت کەسێکی زۆر هەستیار بوو، تەنانەت ئەو کاتەی گەورە بویت و چویتە زانکۆی لەندەن، بە درێژایی کات دڵی بەتۆوە بوو، ئەمەش پاڵی بەمنەوە نا خوێندنەکەم لە فەرەنساوە بگوازمەوە لەندەن، تاوەکو بەردەوام هەواڵی تۆی بۆ بگوازمەوە، بۆیە ئەو کاتانە پەیوەندیم لەگەڵ دایکم دەکرد کە تۆ لەپاڵم بوویت، بۆ ئەوەی دایکت دەنگت ببیستێت و چاوی ڕۆشن ببێتەوە.

- ئایە چیرۆکی دایکم و باوکم و پورمت دەزانی؟

- هەرگیز، وادیارە دایکت ئەم شتانەی بە ئێمە نەوتوە، تاوەکو ئێمە لەشەڕی ئەم ڕێکخراوە شەڕخوازانە بپارێزێت، تەنیا ئەوەم دەزانی کە ئەو خانمێکی فەڵەستینیەو لە ڕوداوێکی هاتوچۆ مێردەکەی لەدەست داوە، هەروەها ناتوانێت پەیوەندی بە کوڕەکەی بکات بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر مەترسی هەندێک شەڕانگێزەوە، بەڵام پێش نزیکەی دوو مانگ و، بەدیاریکراوی دوای کۆچی دوایی پورت،

پورە عائیشە گەشتێکی کورتی بۆ دەرەوەی مەغریب کرد، پاشان گەڕایەوەو نـامەیەکی پۆسـتەی لای دایکـم جێهێشـت کە نهێنـی بەربەڕۆسـای تێـدابوو، داوای لێکـرد لە کـاتی کـۆچی دوایـی یـان دیارنەمانی بە تۆی بگەیەنم، لە کاتی پشوی هاوینم، تێبینی ونبونی دایکتمان کرد بۆ ماوەیەک بێ هـیچ پەیوەنـدیەک، پاشان چوین بۆ ماڵەکەی بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی، چونکە دایکم هەمیشە کلیلێکی ماڵەکەی دایکتی لابوو، کاتێک چوینە ناو خانوەکە پورە عائیشـەمان نەبینـی، هەروەهـا تێبینـی ئەوەمـان کـرد کە کەسـێک مـاڵەکەی بە وردی پشکنیوە، بۆیە دایکم باسی نامەکەی بۆ کردم و داوای لێکردم یەکسەر گەشتبکەم تاوەکو نامەکەت پێ بگەیەنم.

- کەواتە ئەم چەپەڵانە دایکمیان کوشتوە، دوای ئەوەی باوکم و پورمیان کوشت.

- بە تەواوی دڵنیا نین نیزال، دوای ونبونی دایکت هەواڵمان بە پـــۆلیس دا، بەڵام هـــیچ شـــوێنەوارێکیمان نەدۆزیەوە، لە ڕاگەیەنـــدراوی پـــۆلیس دەڵێـــت کە مەغریبـــی لە هـــیچ یەک لە فرۆکەخانەکـــانەوە جێنەهێشـــتوە، بەڵام مـــن پەیوەنـــدیم بە هـاوڕێیەکمەوە کـرد، لە فرۆکەخـانەی (دار البیضـاء) کاردەکـات و وێنەی دایکتم بۆ نارد، کۆمپیوتەری تایبەت بە ئاسایشی فرۆکەخـانە تـوانی ڕوخسـاری دایکـت بناسـێتەوە، بەڵام ئەوەی سـەیرە ئەوەیە زانیاری کۆمپیوتەرەکە دەریدەخات، دایکت بە پاسپۆرتێکی ئێرانـی مەغریبی بەرەو تارانی پایتەختی ئێران جێهێشتوە!

- وادیـاره کاتێـک هیچیـان لە مـاڵەکەی نەدۆزیـوەتەوە، بڕیاریانداوە لەگەڵ خۆیـان بیبەن و بەندی بکەن تـاوەکو زانیـاری لێوەرگرن، ئەمەش ئامـاژەیەکە بـۆ زینـدوو مـانەوەی، ئەگەر ئەوان زانیـاریە خوازراوەکەیـان دەستبکەوتایە، یەکسـەر خۆیـان لـێ ڕزگـار دەکرد!

- بەڵام نیـزال ئەو کەسـانە کـێن کە تـۆ دەربارەیـان قسـە دەکەی؟

- بە تەواوی نـازانم، بە ئەگەری زۆر لەوانەیە ڕێکخراوێکـی تاوانکاری سەر بە حەشاشیە تازەکان بێت، لەبەرئەوەی ئێران قەڵای (ئالمۆت)ی لێیە کە لە کۆندا بنکەی حەشاشیەکان بووە، لەوانەیە ئەم ڕێکخـراوە تازەیـان دووبـارە قەڵاکە بنیـاد بنێنەوە و بیکەنەوە بنکەی خۆیـان، بۆیە پێویسـتە بەرەو ئێران گەشـت بکەم تـاوەکو بەدوای دایکمدا بگەڕێم.

- هاوڕێ ناهێڵم بە تەنها بۆ ئەم شوێنە مەترسیدارە گەشت بکەی!

- عبدالعزیز پێم وایە دایکت زیاتر لەمن پێویستی پێتە، تۆ تاکە منداڵی ئەوی، ئەم کارەش سەرەنجامەکەی ڕوون نیە، سوپاست دەکەم بۆ هەموو ئەو کارانەی لەپێناو من و دایکم کردت، ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە ئەم ڕێگایە بە تەنیایی تەواو بکەم.

- نیـزال، کاتێـک گەشـتم کـرد بـۆ لەنـدەن، تەنیـا هەوڵێکـی سوپاسکردنم بوو بۆ پـورە عائیشـە، دان بەوەدا دەنێم لە سەرەتادا تەنیـا لەبەر ئەم هۆکـارە هەوڵمـدا ببمە هاوڕێت، بەڵام کاتێـک لە

نزیکەوە تۆم ناسی، هەستم کرد برایەکی گەورەم دۆزیوەتەوە کە سالآنێکە بەدوایدا وێڵم، بۆیە من ناهێڵم لەم بەرەنگاریە بەتەنیا بیت، بەتـــایبەت دوای ئەوەی چیرۆکـــی دایکـــت و قوربـــانی دانەکەی و قوربانیدانی تەواوی خێزانەکەتم بیست، هەروەها ناکرێت لەم گەشتە پـڕ مەترسـیە پشـت بە یـادگە لاوازەکەت ببەسـترێت، عبـدالعزیز بە زەردەخەنەوە کۆتا قسەی کرد.

- با بەو شێوەیە بێت کە تۆ دەتەوێت هـاورێ، بەڵام پێش گەشتەکەمان بەرەو ئێران، دەبێت بەرەو مصر گەشت بکەین تاوەکو لێکۆڵینەوە مێـژوویەکە وەربگـرین کە دایکـم بـۆی جێهێشـتوم، ئەم لێکـۆڵینەوەیە کـارتێکی فشـارە دژی حەشاشـیە تازەکـان بەکـاری دەهێنین لەپێناو سەلامەتی دایکم، هەروەهـا وەکـو خواردنێکیشـە کە بە هـۆیەوە چەتەکـانی قـدیس یۆحەنـا پەلکـێش دەکەیـن تـاوەکو بەژداری لە ئازادکردنیدا بکەن لە دەستی حەشاشیەکان.

- ئـایە ئەم لێکـۆڵینەوە دەدەیـنە دەسـتی ئەم دوو ڕێکخـراوە نیزال؟

- هەرگیــز عبـدالعزیز، بـاوکم و پـورم قوربانیـان بە ژیانیـان نەداوە، هەروەهـا دایکـم قوربـانی بە گەنجی نەداوە، تـاوەکو مـن لە کۆتایدا خیـانەت لە قوربـانی دانەکەیـاندا بکەم و ئەم لێکـۆڵینەوەیە بـدەمە دەسـت کۆمەڵێـک چەتە و حەشاشـی، بەڵکـو مـن ئەم دوو گـروپە بەیەکتـری دادەدەم و لە دژی یەکتـری بەکاریـان دەهێـنم، لە کۆتایشـــداهیچ شـــتێکیان لەمـــن دەســـت ناکەوێـــت جـــگە لە بەدەستەوەدانی دادگەری، بۆ ئەوەی سزای شیاوی خۆیان وەربگرن.

- هیچ بیرۆکەیەکت دەربارەی سروشتی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە دایکت بە درێژایی ئەم ساڵانە ئەنجامی داوە هەیە؟ هەروەها ئەو نهێنیە چیە کە هەموو ئەم کەسانە بەدوایەوەن؟

- بەم زوانە ئەم شتانە لە شاری ئیسکەندەریەی مصری دەزانین، بەڵام من گومانم وایە کە بابەتەکە دەربارەی قەشەی مەسیحی یەکتاپەرست (ئاریۆس)(Arius ) بێت!!

- نیزال، ئەم قەشەیە کێیە باسی دەکەی؟

- ئەم کەسە یەکێکە لە قەشەکانی شوێنکەوتەی حەزرەتی عیسا و، لە کۆتایی سەدەی سێیەمی زاینی و سەرەتای سەدەی چوارەم ژیاوە.

- بۆچی پێت وایە لێکۆڵینەوە مێژوویەکەی دایکت پەیوەست بێت بەم قەشەیەوە؟

- لەبەر چەند هۆکارێک، کە یەکەمیان لە خودی نهێنی بەربەرۆسا هەیە، وەکو بینیمان هەر هێمایەک لە هێماکانی نهێنی بەربەرۆسا بە شوێنێکی دیاریکراو ئاماژەدەکات، بێژینگی ئیراتوستینس رێنیشاندەرمان بوو بۆ دۆزینەوەی ئەو ژمارانەی لە نهێنی بەربەرۆسا کارمان پێی بوو، من لەسەرەتاوە لەوە سەرم سورمابوو کە بۆچی لە جیاتی نوسینی ئەو ژمارانەی پێویستمانە وێنەی بێژینگێک کێشراوە، بەڵام ئێستا پێم وایە کە خودی بێژینگەکە ئاماژەیە بۆ ئەو شوێنەی چەقی نهێنیەکەی لێیە، هەر بۆیە گۆی زەوی لە ناوەڕاستی دانراوە، نەک تەنها وەکو ئاماژەیەک

بۆ ئیراتوستینس کە چێوەی زەوی دۆزیەوە، بەڵکو هەروەها وەکو ئامـاژەیەک بـۆ ئەم نهێنـیە مەترسـیدارە لە مێـژووی زەوی کە وەکـو نهێنیەکی پەردەدراو نەدەهێڵرا کەس ئاشـکرای بکـات، ئامـاژەدان بە ئیراتوسـتینس هێمـایەکی گەورەیە بـۆ ئـاریۆس، ئیراتوسـتینس لە شاری (شحات)ی لیبی لەدایکبووە، هەمان ئەو شارەی کە ئاریۆسـی تێـدا لەدایکبـــووە، پاشـــان لە شـــاری ئیســـکەندەریەی مصـــری نیشتەجێبووە، هەمان ئەو شارەی کە ئاریۆسـی تێـدا نیشـتەجێبووە، لە سـەرەتاوە تـۆ بۆچـونەکەت ڕاسـتبوو کە پێتوابـوو مەبەسـت لە بەکارهێنـــانی پەڕی (بەردی) وڵاتـــی مصـــرە، بەکارهێنـــانی پەڕی بەردی تـاوەکو نهێنـی بەربەڕۆسـای لەسـەر بنوسـرێت ئامـاژەیەکی بەهێزە بۆ شـاری ئیسـکەندەریەی مصـری، کە سـەرچاوەی یەکەمـی پەڕی بەردی بـوو لە جیهـان، سـەرەڕای ئەوەش هەڵبژاردنـی شـاری ئیسـکەندەریە لەلایەن دایکـم تـاوەکو لێکـۆڵینەوەکەی تێـدا بکـات، هەروەها هەڵبژاردنی ئەم شارە مصریە تاوەکو لێکۆڵینەوەکەی تیادا حەشاربدات، هەموو ئەمانە بنچینەیی بوونی شـاری ئیسـکەندەریەمان بـۆ دەردەخـات لە سەرکەشـی داهاتومـان، ئەم شـارەش خـاڵی دەستپێک بـوو بـۆ بـانگەوازە یەکتاپەرستیەکەی ئـاریۆس لە هەمـوو جیهان، کە وێنەی گۆی زەویەکەی ناو بێژینگەکەی نهێنی بەربەڕۆسا ئاماژەی پێدەکات.

- خاڵی دووەم چیە نیزال؟

- هاوڕێ خاڵی دووەم، نامە دەنگیەکەی دایکمە، دایکم دەڵێت ئەم نهێنیە بۆ ماوەی زیاتر لە (١٥٠٠) ساڵ بە شاراوەیی مـاوەتەوە،

ئەمەش ئامـاژەیە بـۆ ئەوکـاتەی ئـاریۆس و شـوێنکەوتوانی تیایـدا دەرکەوتـن، سـەرەڕای ئەوەش ئەو مێـژووەی دایکـم هەڵیبـژاردوە بـۆ تۆمارکردنی ئەم نامە دەنگیە، ئەویش ٢٠ی مانگی مایۆیە.

- ئەم مێژووە چی دەگەیەنێت؟

- ئەم مێژووە ٢٠ی مایۆی ٣٢٥ز، ئەو ڕۆژەیە تیایدا کارەکانی کۆنگرەی یەکەمی مەسکونی ناسـراو بە (کـۆنگرەی نیقـیە) ( First Council Of Nicaea) بەسترا.

- چیرۆکی ئەم کۆنگرەیە چیە؟

- چیرۆکەکەی درێژە هـاوڕێ، دواتـر بـۆتی بـاس دەکەم، بەڵام بەسـە ئەوە بزانـی ئـاریۆس سـەرکردەی یەکێـک لە دوو گـروپە بەژداربوەکەی ئەم کۆنگرەیە بوو.

- نیزال دەتوانم لە هەوڵی سوارچاکانی قدیس یۆحەنا تێبگەم بۆ گەیشـتن بە نهێنـی ئـاریۆس و هێشـتنەوەی بە شـاراوەیی، بەڵام بۆچی حەشاشیە نوێیەکان هەوڵی گەیشتن بەم نهێنیە دەدەن؟!

- هاوڕێ بابەتەکە پەیوەستە بە دەسەڵات و هێزەوە!

- لە مەبەستت تێناگەم، باسی کام دەسەڵات و هێز دەکەی؟

- هەر ڕێکخراوێکـی تاوانکـاری ئامـانجی زاڵبـوون بێت بەسـەر مرۆڤایەتیدا، لە سەرەتادا هەوڵـی بەدەسـتهێنانی شتێکی زۆر گرنـگ دەدات، کە یارمەتی بدات بـۆ گەیشـتن بە ئامـانجەکەی، ئەم شتەش بریتیە لە سامان!

- تا ئێستاش لە قسەکانت تێنەگەیشتوم، پەیوەندی سامان و دارایی بە نهێنی ئاریۆس چیە؟

- باش گوێبگره عبدالعزیز، دوای کۆچی ئاریۆس، کۆمەڵێک قەشە و پاشای جیهان شوێن مەزهەبی یەکتاپەرستی کەوتن، کە دواتر بە ناوی ئاریۆس ناسرا، بۆیە ئەم مەسیحیە یەکتاپەرستانە بە (ئاریسیەکان) (The Arians) ناسراون، ئەوەندە بەسە بیزانی گەورەترین و دەوڵەمەندترین ئیمپراتۆری ڕۆمانی بیزەنتی لە مێژوودا ناسراوە بە (ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە) (Emperor Constantine The Great)، لەنێو ئەم یەکتاپەرستانەدا بووە، دوای ئەوە ڤانداله ئاریسیەکان لە ساڵی ٤٥٥ز توانیان ڕۆمای پایتەختی دەوڵەتی ڕۆمانی داگیربکەن و هەڵسان بەدەرهێنانی زۆرێک لەو گەنجینەیەی کە ڕۆمانیەکان لە گەلانی زەویان دزی بوو، ئەم گەنجینەیە گوازرایەوە بۆ ئەو زەویانەی باکوری ئەفریقیا کە دەستیان بەسەرداگرتبوو، بەتایبەت پایتەختەکەیان لە تونس، عبدالعزیز بێنە پێش چاوی خۆت بڕی ئەو گەنجینەیە چەندە کە لەوانەیە تاوەکو ئەمڕۆ لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاریسیەکان حەشاردرابێت، بێ گومان ڕێکخراوێکی تازە پەیدابووی وەکو حەشاشیە تازەکان هەوڵدەدەن بەم گەنجینە گەورەیە بگەن بۆ ئەوەی بۆ دەستپێکردنی پلانە نەگریسەکەیان بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان پشتی پێ ببەستن.

- هەر بەڕاست ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە لە ئاریسیەکان بوو؟

- زۆربەی سەرچاوە ڕۆژئاوایەکان ئەمە پشت ڕاست دەکەنەوە، بەسە ئەوە بخوێنیتەوە کە مێژوونوسی ئەمریکی پرۆفیسۆر (مارک

ئیلینگسـۆن) لە ئینسـکلۆپیدیا مێـژوویە گەورەکەی بەنـاوی (گەڕانەوە بـۆ ڕیشـەکانمان) (Reclaiming our roots) نوسـیویەتی، تیایـدا دەڵێت: (قوسـتەنتین و جێگرەوەکـانی ژیـانی سەرکردەکانی کەنیسەی نیقیەو بانگەوازە سیانیەکەیانی زۆر نـاخۆش کـرد)، بەڵام لە سـەرچاوە عەرەبیەکـان دەتـوانی ئەوە بخـوێنیتەوە ئیمام ئیبن حەزمـی ئەندەلوسـی لە کتێبەکەی (الفصـل فـي الملـل والأهـواء والنحـل) لەبـارەی ئـاریۆس نوسـیویەتی: (مەسـیحیەکانیش چەند گروپێکن یەکێک لەوانە شوێنکەوتوانی ئاریۆسن، کە قەشەیەک بـوو لە ئیسـکەندەریە، لە وتەکـانی یەکتاپەرسـتی تەواوی ڕاگەیانـد، هەروەها ڕاشیگەیاند عیسـا بەنـدەیەکی دروسـتکراوە، بەهـۆی وشـەی خوای گەورەوە کە ئاسمانەکان و زەوی پێ دروستکراوە، ئـاریۆس لە سـەردەمی قوسـتەنتینی یەکەم بنیـادنەری قوسـتەنتینیە بـوو، قوستەنتین یەکەم پاشای ڕۆمەکان بـوو کە مسـوڵمان بـوو و لەسـەر مەزهەبی ئاریۆس بوو).

- بەڵام پێـت نەوتـم چیرۆکـی ئـاریۆس چیە لە سـەرەتاوە؟ هەروەها چیرۆکی ئارییسیەکان چیە؟ چۆن توانیـان بـگەنە لـوتکەی دەسـەڵاتی دەوڵـەتـی ڕۆمـانی؟ بـۆ کـوێ ونبـون؟ بۆچی دەیانەوێت مێژووەکەیان بە نادیاری بمێنێتەوە؟
- باسـکردنی ئەم بـابەتە درێـژە دەکێشـێت هـاوڕێ، دەتـوانین لەکاتی گەشتەکەمان بەرەو ئیسکەندەریە باسی بکەین.
- باشـە نیـزال، هەروەهـا دەمەوێـت تەواوکـاری چیـرۆکەکەی خۆتم بۆ باسبکەی، تـۆ لەکـاتی گەڕانمان بەدوای نهێنی بەریەڕۆسـا

تەنها باسی منداڵی خۆتت بۆکردم، هەر بەم بۆنەیەوە نیزال،چیتر باسی ئەو منداڵە بلیمەتەت بۆ نەکردم کە لە منداڵی سەرچاوەی ئیلهامت بوو.

- نیزال بە زەردەخەنەوە پرسی: مەبەستت ئەحمەدی کوڕی دراوسێمانە؟

- بەڵێ مەبەستم ئەوە، ئەم منداڵە گۆشە نیگای زۆر فراوان بوو، پێم وایە ئێستا ئەو بۆتە زانایەکی گەورەی وەکو جەزەری، تا ئێستا پەیوەندیت لەگەڵی هەیە؟

- بەداخەوە نەخێر، لەو کاتەوە کە ئەو گەیشتە پۆلی چوارەمی سەرەتایی پەیوەندیم لەگەڵ ئەحمەد پچرا، من و ئەو کەوتینە دوو ڕێی جیاواز، لەکاتێکدا من بەرگەی ئەو پاڵەپەستۆیەم دەگرت کە لە قوتابخانە لەسەرم بوو، ئەو خۆی بەدەستەوەدا، دوای ئەوەی منداڵێکی ڕوخۆش و داهێنەر بوو، سیستەمی پەروەردەی شکستخواردوو بە تێپەڕبونی کات گۆڕی بۆ ئامێرێکی مرۆیی کە لەلایەن کەسانی ترەوە بەرنامەڕێژ دەکرا، ئەو ڕوحی داهێنانەی لە منداڵیەوە هەیبوو لەدەستیدا، تەنانەت ڕوخۆشیەکەشی بەتێپەڕبونی کات لەدەست دا، ئیدی چیتر ئەو چیرۆکانەمان لێی نەبیست کە چێژمان لێدەبینی و سودمان لێ دەبینی، ئیتر ئەحمەدی کوڕی دراوسێکەمان تەنها ئەو شتانەی دووبارە دەکردەوە کە لە مامۆستاکانی دەیبیست!

- بەڕاستی جێی داخە، بەم قسانەت وات لێکردم حەزبکەم تەواوی چیرۆکەکەتم گوێلێبێت ١٠١، پێشتر هەوڵمدەدا خۆم

دوربخەمەوە لە پرسیارکردن دەربارەی خۆت، تاوەکو نەبمە جێی گومانت، بەڵام ئێستا دەمەوێت زیاتر دەربارەی خۆت و چیرۆکەکەت بزانم، دەمەوێت چیرۆکەکەتم بۆ تەواو بکەی، ژیانت لە فەڵەستین چۆن بوو دوای لەدەستدانی دایک و باوکت؟ چۆن توانیت لەم بارودۆخە سەختەی ژیانت بگەیتە بەریتانیا؟

نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- هاورێی شیرینم عبدالعزیز، ئێمە بەرەو گەشتێکی نادیار و درێژ دەڕۆین نازانین دەگەڕێینەوە یان نا، ئەگەر خودا ویستی و لە ژیان ماینەوە، بەڵێنت پێدەدەم لە درێژەی گەشتەکەمان چیرۆکەکەمت بۆ تەواوبکەم، بەڵام پێش هەرشتێک دەبێت چەند کارێکی گرنگ بکەین بۆ ئەوەی خۆمان بۆ بەرەنگاریە نوێکەمان ئامادەبکەین..... سەرکەشی (تحدی) گەڕان بەدوای (**نهێنی ئاریۆس**)!

❊ ❊ ❊

**گەشتەکە بەردەوامە**...........

# بەرهەمەکانی ناوەندی ڕەها

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر و وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١ | ئیسلام یان ئیلحاد | ئەیاد نادر |
| ٢ | جوانتر بیربکەوە | سبحان سید |
| ٣ | دێری نامەکان | تەنیا محەمەد |
| ٤ | کچی کافرۆش | هێدی سەلیم |
| ٥ | هونەری جەنگ | ن: زون تسو<br>و: نیاز مەستی |
| ٦ | پیانۆ | محمد جمیل عەلی |
| ٧ | عاشقانە دێم | زامدار قادری |
| ٨ | چیرۆکی ڕەوشتە بالاکان | محمد کەریم حاجی |
| ٩ | ئایا دەکرێت خوێن دروست بکرێت | ئەحمەد محەمەد نەقاش |
| ١٠ | ژیاننامەی زانایانی کورد | زانا قەرەداغی |
| ١١ | ستیڤ جۆبز کێ بوو؟ | ڕەوەند حەکیم |
| ١٢ | بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهان | ن: عائض القرني<br>و: نیاز مەستی |
| ١٣ | پێشەوا زینو العابدین عەلی کوڕی حوسێن | عەبدولڕەحمان موحەمەد ئەمین |
| ١٤ | ماهی نوورین | هێدی سەلیم |
| ١٥ | ئەبولحەسەنی ئەشعەری قوتابخانە کەلامی و فەلسەفییەکەی | عەدنان ئەمین |
| ١٦ | هونەری ئاخاوتن | ن: ئیهاب فکری<br>و: دەشنێ تالیب شوانی |
| ١٧ | ١٠١ کۆدی بەربەڕۆسا | ن: جیهاد الترباني<br>و: ئەحمەد حەمەئەمین مەنتک |

- چیرۆکی بەربەرۆسا چی یە؟ چۆن توانی هەزاران بێتاوان لەدەست دادگاکانی پشکنین لە ئیسپانیا ڕزگار بکات؟
- بێژینگەکەی ئیراتوستینس چیە؟ بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناتچی چیە؟ پەیوەندی هەریەکەیان چیە بە کۆدی بەربەرۆسا؟
- مسوڵمانان چۆن توانیان فەڕەنسا لە داگیرکردن بپارێزن؟هەروەها چۆن پاشا فرانسوای یەکەم بەندەری تۆلۆنی فەڕەنسی گۆڕی بۆ بنکەیەکی سەربازی دەریایی بە سەرکردە بەربەرۆسا؟
- قەڵای ترسناکی ئالمۆت دەکەوێتە کوێ؟لە ناوەوەی ئەمقەڵایە چی ڕویدەدا؟
- چیرۆکی ڕاستەقینەی پاڵەوانی فیلمی چەتەکانی کاریبی جاک سپارۆ چیە؟ئایە مسوڵمان بوو؟ پەیوەندی بە تونسەوە چی بوو؟
- جەزائیر چۆن بویە بنکەی بەهێزترین کەشتیگەلی دەریایی لە جیهان؟
- چیرۆکی دەوڵەتی تێکۆشەرانی دەریا چیە؟هەروەها ئەو سەرکردە هۆڵەندیە مسوڵمانە کێیە کە سەرکردەی ئەم دەوڵەتە بوو؟
- ئەو سەرکردە ئیتاڵییە مسوڵمانە کێ بوو کە بویە سەرکردەی گشتی کەشتیگەلی ئیسلامی؟ پلانی چی بوو بۆ گێڕانەوەی ئەندەلوس؟
- چیرۆکی ئەو قاسە ژمارەیە چی بوو کە جەزەری دروستیکرد؟ ئەو کتێبە سەیرەی چیبوو کە لیۆناردۆ داڤنشی سوربوو لەسەر خوێندنەوەی؟




بەرگ: محمد جبار

1234567890

ناوەندی ڕەها

هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
0750 406 66 74
ڕەها / RAHA
نرخ 5500 دینار